## پێشەکی

سینتاکس لە هەموو زمانێکدا هەر هەمان باری ڕێزمانی دەبێت و کۆمەڵە ووشەیەکی سینتاکسی، کە بڕێتی دەبێت لە بەشی بنجی ڕستە، توانای بە ڕادەیەک فراوانە کاریگەری دەکەوێتە سەر تەواوکارو بۆی هەیە بەشانی دیش لە ڕستەدا بگرێتە خۆی ئەم ئەرکە بە تایبەتێتی سینتاکسی بەشەکانی ڕستەوە پێوەستە.

ڕێزمان بە گشتی ئەم لایەنانە دەخاتە ڕوو:

١ـ ڕێزمانی گشتی، کە بابەتی سینتاکس، مۆرفۆلۆژی ، فۆنۆلۆژی، سیمانتیک دەگرێتە خۆی.

٢ـ سینتاکس، کە سەربەخۆیەکی ئۆتۆنۆمی هەیە.

٣ـ سینتا[illegible] لە هەموو زمانێکدا بۆ ڕێزمان دەگەڕێتەوە.

٤ـ ڕێزمانی گشتی سینتاکس سستێمێکی ـ شیکردنەودیە، کە لە ڕێی دەستوورو شیکردنەوە دا دەناسرێت و سنووری بۆ دادەندرێت.

٥ـ فێربوونی هەر زمانێک پێوەندی بە شیکردنەوەی تایبەتی زمانەکە خۆیەوە هەیە.

سینتاکس لە نێو ڕێزماندا شوێنی ناوەڕاستی گرتۆتەوە، هەروەک لەم شێوە ساکارەی ژێرەوەدا ڕوونکراوەتەوە، سینتاکس و ووشەی فەرهەنگی فۆرمی ئەو دوو دانەیەن، کە دەسەڵاتیان بەسەر دوو پێکهاتنی سەربەخۆدا هەیە، کە یەکێکیان فۆنۆلۆژی و ئەوی دیان سیمانتیکە:



ڕێزمان نووسانی ڕێبازی کلاسیکی، کە لە ڕستەیان کۆڵیوەتەوە، لە نێو بەشەکانی ئاخاوتندا ڕوونیان کردۆتەوە، بەواتا بەشەکانی ئاخاوتن و بەشەکانی ڕستەیان هەر لەنێوان یەک بابەتدا باسکردووە، بۆیە فرێزی ناوی وفرێزی کاری و دۆخی سینتاکسی ڕستەیان لەپاڵ ناو، ئاوەڵناو، جێناو ... باسکراون و ئەم ڕێبازە تا ساڵانێکی زۆر دوورو درێژ پێڕەوکراوە.

پانینی[1]ڕێزمان نووسی ناوداری هیند، کە بە کۆنترین ڕێزمان نووسی سانسکریتی دە ژمێردرێت، لە نێو بەشەکانی ڕستەدا هێمای بۆ (سەرکار ـ نیهاد ـ Subject)و (ووشەی کار ـ گوزارە ـ Predicate) کردووە. لێکدانەوەی بابەتانەی پانینی بۆ ڕێزمانی سانسکریتی وای لە زانا (Bloomfield 1933.11) کردووە، بەم جۆرە گرنگی ئەو بەرهەمەی پانینی هەڵسەنگێنێت (یەکێکە لە مەزنترین شوێنەواری توانایی و لێکدانەوەی مرۆڤ) هەروا ئەوەشی خستۆتە سەر کەوا (هیچ زمانێکی دی هەتا ئەمڕۆ بەم تەواوییە لێک نەدراوەتەوە).

ئەرستۆ، کە هاوچەرخی پانینی بووە، ئەویش لە نووسینەکانیدا هێمای بۆ هەمان ئەو بەشانەی ڕستەی کردووە، کە پانینی باسیکردووە. بەرهەمەکانی ئەرستۆ لەڕووی زمانەوە لەلایەن دیۆنیسوس ثراکس، ئەپۆلۆنوس دیسکۆلوس و هی دی پەرەی پێدراو کاریگەری ڕێبازی ئەرستۆ هەر وە کو Bloomfield بۆی چووە، تا سەدەی هەژدەی زایینی خایاندووەو لەم سەدەیەدا زاناو فەیلەسوفی نێودار Humboldt (Karl) (Wilhelm Baron) (١٧٦٧ـ١٨٣٥) هەڵکەوت و لەبارەی زمان ئەوەی لێکداوەتەوە، کەوا زمان کردەوەیەکە کەسیەتی و پلەی کولتووری کەسەکار پێشان دەدات و هەروا ئەوەشی ڕوونکردۆتەوە، کەوا بەهۆی زمانەوە مرۆڤ توانی لە کرۆکی ژیان و لە دەوروبەری خۆی بگات، بەرهەمانی زمانەوانی Humboldt ڕێ خۆشکەرو ڕێ ڕووناککەرەوە بوون بۆ چۆمسکی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

هەرکە William Jones بیروڕای خۆی لە بارەی زمانی سانسکریتی لە ساڵی ١٧٨٦ دا بڵاوکردەوە، زمانەوانان ڕێبازی (مێژوو) و(بەراوردکاری)یان بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەوانی پێڕەوکرد، لەم کاتەدا

هەروەکوMax Muller باسیکردووە، سانسکریتی بوو بە تاکە بنکەو تاکە ڕێبەری بواری فیلۆلۆژی بەراوردکاری.

لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا ڕێبازیSynchronic بۆ لێکۆڵینەوە لە زماندا سەری هەڵدا. کەئەم سێ زانایانەی ژێروو بە بۆچوونەکانی خۆیان ڕۆڵی تەواویان تێدا گێڕاوە، ئەم تیۆرییە بایەخی هەرە مەزنی بە شێوە و داڕشتن داوە لە کات و شوێنی دیاریکراودا هەروا ڕەخنەی لە ڕێبازی کلاسیکی گرتووە بەوەی لە مانای کۆڵیتەوە، کەچی دەبینین لە نیوەڕاستی ئەم سەددیەدا بایەخدان بە مانا سەر لەنوێ لە نوێترین تیۆری زماندا سەر لە نوێ بەدەردەکەوێتەوە.

زاناFerdinand de Sasussure کە داوای لێکۆڵینەوەی زمانەوانی لە هەردوو باری Diachrony وSychronic ی کرد، بنکەی تیۆری نێو براوی دانا.

زاناLeonard Bloomfield کە دەستێکی باڵای هەبووە لە داڕشتنی ئەم تیۆریەدا پێکهاتنی زمانی لە ڕووی ئەو دانە دەنگانەوەی سەیر دەکرد، کە لە نێو خۆیاندا کۆدەبنەوەو مۆرفیم دروست دەکەن و ووشە پێک دەهێنن و ئەوانیش لە کۆبوونەوەی خۆیاندا ڕستە دادەڕێژن و ئەم ڕێبازە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٥ـ١٩٥٠ دا زۆر پێڕەو دەکرا.

زاناEdward Sapir شێوەکانی زمانی لە سێ ڕەگەزدا دەدیت، کە سینتاکس، ووشەو ڕستە بوون و لێکۆڵینەوەی لەم شێوانەی زماندا لەسەر داڕشتنەکانی دەرەوەیان بەند بوو، نەک لەسەر واتایان، بەڵام واتاشی پشت گوێ نەخستبوو، چونکە ڕستە لای ئەو دەربڕینێکی زمانییە بۆ دۆزێک .

لەنیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا زانا ــ نعوم چۆمسکی تیۆری -Trans formational generative ی داڕشت، کەلای ئەو سینتاکس هەر ئەوە نییە، کە ڕستە لە ڕووی ڕووکەشی دەرەوەیدا شی بکاتەوە، بەڵکو شی کردنەوەی ڕستە دەبێت واتای زمان بە گشتی لە فۆنۆلۆژی، داڕشتن وسیمانتیکیش بگرێتەوە، هەروا لای چۆمسکی زمان ڕەگەزێکی داهێنەرە، چونکە زمان لە چەند دەنگێکی دیاریکراو پێکهاتووە، کەچی بۆی هەیە ڕستەی ڕادە بەدەر دابڕێژێت و سینتاکسیش لەسەر چەند بنج و

بنەمـايەكی دیاریكراودا ڕسـتـە پێک دەهێنێت، كـەچی ئەم بنجـانە بۆیان هەیە ڕستەی لە ڕادە بەدەر بهێننە كایە.

چۆمـسكی لە تیـۆرێكەی خـۆیدا چەند ڕێبـازێكی شـیكردنەوەی سینتاكسی گرتۆتە بەر، سەرەتاكەی Finite State Grammar بوو، لەم بۆ چوونەیدا چۆمـسكی ئەوە ڕوون دەكـاتەوە، كـەوا ڕەگـەزی دەسـتپـێكی ڕسـتـە كـاریگەری لەسـەر پەیدابوونـی جـۆری ڕەگـەزی دوای خـۆی هەیە، هەروەكو لە لاپەڕە (١٩) ی چاپی (١١)ی بەرهەمی (-Syntctic Struc tures1975)دا دەنووسێت، كە ڕسـتـەیەک بە The دەسـتی پـێكرد، بۆی هەیە Man وەیـاMen ی بە دوایدا بێت، لە كـاتی هەڵ بژاردنی Man دا كـارەكەی دوای ئەو دەبێت لە دەمـكاتی Comes دا بـێـت، چـونكـە man كەسی سێـیـەمی تاكە، بەڵام لە كـاتی هەڵبژاردنی men دا كـارەكـە هەر come دەبێت:




بۆ زێتر فراوانكردنی ئەم ڕستەیەی پێشوو، بۆ وێنە وەک بەكارهێنانی دیارخەرێک، ئەم نەخشەیەی بۆ نەخشاندووە:



لە دوای ئەمەدا چۆمسکی ڕێگەی phrase structure بەکارهێنا، لەم ڕێگەیەدا ئەو ڕەگەزانەی ڕستەی داناوە، کە بەر لەویشدا لە شیکردنەوەی ڕستەدا بەکارهاتوون، وەک ڕەگەزی بکەر، ووشەی کار، بەرکار و ... بەلاّم چۆمسکی هەوڵی داوە بە یارمەتی مەنتیکەوە بگاتە چەند جۆرە دەستورێکی زانستانە بۆ شیکردنەوەی ڕستە، هەروە کو بەم جۆرەی ژێروو لە لاپەڕەی (٢٧)ی سەرچاوەی پێشوودا هاتووە:




لەدوای لێکدانەوە چۆمسکی ئەوەی بۆ دەرکەوت، کەوا دەستووری ئەم ڕێبازە نابێتە پێوانە بۆ هەموو زمانێک، بۆیە ڕووی لە ڕێگەی سێیەم کرد، کە ڕێبازیTransformational Grammar لەم ڕێبازەیدا لەبنیاتی ژێرەوەی ڕستە دەکۆڵێتەوە، بەواتا لایەنە ژێریکەی شی دەکاتەوە جا ڕووکەشی دەرەوەی لێکدەداتەوە، لێرەدا چۆمسکی ئەو نیشانانەی ڕێگەی پێشتری Phrase Struture ی بەکارهێناوە لەگەڵ فراوانکردنیان، بۆ وێنە لە ڕێگەی دووەمدا تاک وکۆ و دەمکاتی کاری خستۆتە ڕوو، بەلاّم لە ڕێگەی گوێزانەوەدا کاری کارا بزریشی خستۆتە سەر، چۆمسکی بنکەی تیورییە پەرە سەندۆکەی خۆی بۆ ڕێزمانی گشتی لە لاپەڕە (٥)ی Lec-tures on Government and Biniding 1981 چەسپاندووەو زانایان

F.G.Droste& F., van Eynde لەساڵی ١٩٩١ بنکەی ئەم تیۆرییەیان لە لاپەڕە ١٤٦ ی بەرهەمەکەی خۆیاندا بەم جۆرەی ژێروو نەخشاندووە:



ڕێبازی گوێزانەوە لە سینتاکسدا ئەم دەستوورانە دەگرێتە خۆی : دەستووری لە نێوبردن، کورتکردنەوە، جێگەگرتنەوە، خستنەسەر، سەرلەنوێ ڕیزکردنەوەو فراوانکردن.

هەروەکو دەبینین تیۆرێکەی چۆمسکی، کە لە ساڵی ١٩٥٧دا بلاوی کردەوە، تا چەندین ساڵ هەر لە شیکردنەوەو فراوانکردن و پێدا چوونەوەدا بوو، نەک هەر لەلایەن خۆیەوە، بەڵکو لەلایەن زانایان و شارەزایانی دییەوەش، هەربۆیەیە سالانی نێوان ١٩٧٠ـ١٩٨٠ بە سالانی دان و سەندن و لێکۆڵینەوە و گفت وگۆ لەسەر ئەم تیۆرییەکردن دەژمێرێت (Zonneveld van Ron 1994) هەتاوەکو بابەتێکی سەربەخۆی لێهات و لە داوودەستگە زمانەوانیکاندا دە خوێندرێت و پێڕەوکردنیشی لە لێکۆڵینەوەی بابەتانی زمانیشدا بۆ ئارەزووی لێکۆڵەرەوان دەگەڕێتەوە.

لێکولینەوەی زمانەوانی خۆی لە جۆرە بابەتانی دیش داوە، بە تایبەتی ئەو زمانەوانانەی مامەڵە لەگەڵ ڕێزماندا دەکەن، بۆیان دەرکەوتووە، کە ئەو شێوە ڕێبازەی لە ڕێزماندا پێڕەوی دەکەن، لە زانستی زمانی ـ ماتماتیک و زانستی زمانی ـ جەبریشدا دەتووانن بەکاری بهێنن، بۆیە لە سەدەی ڕابوردووەوە لێکۆڵینەوەی زانستی زمانی ـ ماتماتیک بەرچاو دە کەوێت (Boole G.1847) کە چەندین زاناو شارەزایانی دی لەم سەدەیەدا بەم لێکۆڵینەوانەی زانای نێوبراودا چوونەتەوە لەوانە

(Sikorski R. 1913.Tarski A.1955, Stone M.H.1936) و...

هەر لەم بوارەی زانستی زمان وماتماتیک وجەبردا زانایان (Zwarts F.1986,Russell B.1903,1919 Quine W.V.O.1951) و زانایانی دیش لێکولینەوەی زانستانەیان بلاوکردۆتەوە بە هۆی داهێنانی کۆمپیوتەریش دەیان بابەت و تۆژینەوەی زانستی لە سەر زانستی زمانی ـ کۆمپیوتەر پەخش کراوەتەوە (Fried J.1971, Schak R. 1973 Landsbergen S.P1977) ئەوەی شایەنی باسە کۆمپیوتەر ئامێرێکی زۆر سوود بەخشە بۆ ڕێبازی گوێزانەوە لە سینتاکسدا.

نووسینی کۆن، کە پێوەندی بە ڕێزمانی کوردییەوە هەبێت و لەلایەن کوردەوە نووسرابێت، لە نێو چووەو نەماوە، بەلام نووسەرانی ناکورد تاک

وتەرا باسیان کردوون، بۆ وێنە لە شوێنەوارێکی نووسیندا،کە بە ئەلف و بێی ئەلبانی نووسراوەتەوەو لە سالّی ١٤٤١ زا. لەلایەن چەند نووسەرێکەوە نووسینەکە تەوابووە. هێما بۆ ئەوە کراوە، کەوا (ماد)ەکان ئەلف و بێیان هەبووە ( Wahn 3e 1938 ) لەژێر تیشکی تێکستێکی کوردیدا لەم دەستنووسەدا ئەوە روون دەبێتەوە، کەوا (ماد)و(کورد) سینۆنیمی یەک بوون. هەروا شیخ ابو بکر بن وحشیە النبطی لە بەرهەمی (شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام) دا، کە لە سالّی ٢٤١ی کۆچی دەوروبەری (٨٢١ زا. )دا نووسیویەتی ناوی دوو نووسەری کوردـبینو شادوماسی سوراتی دەبات، کە ئەلف و بێی تایبەتیان بۆ زمانی کوردی داناوە.

ئەو نووسراوانەی، کە لەچەند سەدەیەکی رابوردوودا لە بارەی زمانی کوردیدا نووسراون و بەپارێزراوی ماون، ئەو بابەتانەن،کە لەبەرهەمی گەرۆکە بێگانەکاندا بەر چاو دەکەون کە هەر یەکەو بەزمانی خۆی و بۆ مەبەستێکی تایبەتی و بەرێبازی کلاسیکی بە پچڕ پچڕی لە دەستوری زمانی کوردیان کۆڵیوەتەوە (د.کوردۆیێف ـ١٩٨٤).

لەم سەدەیەدا کورد بایەخی بە رێزمانی خۆی داوەو بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا پسپۆری لێهاتووی کورد لەم بوارە دا هەڵکەوتن و بەرێبازێکی زانستانە لە بابەتەکانی جۆراو جۆری رێزمانیان کۆڵیوەتەوە، چ بە زمانی کوردی و چ بە زمانی بیانی، سینتاکسی رستەی کوردی بابەتێکە هێژ بە تەواوی لە هەموو لایەنێکی نەکۆڵدراوەتەوەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زێتر هەیە.

کەرەستەی سەرەکی ئەم بەرهەمەی بەردەست ئەو بەرهەمەمە، کە بەنێوی(سینتاکسی رستەی سادە لە زمانی کوردیدا)یەولە سالّی ١٩٨٦دا لە بەغدا چاپم کردووە، هەلبەت لە ژێر تیشکی دەیان دوابەرهەمی سینتاکسی بە زمانانی هۆڵەندی، رووسی وئینگلیزی، بەو هیوایەی ئەم لێکۆڵینەوەیەش ببێتە بنکەو سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەی فراوانتری دی لەو بابەتانەی، کە لەم پەرتووکەمدا لێیانم کۆڵیوەتەوە.

هۆڵەندە ١٩٩٦

## فرێزی ناوی

١ـ١ ئەو بەشانەی ئاخاوتن، کە بەر کۆمەڵەی فرێزی ناوی دەکەون (ناو، ناوەڵناو، جێناوو چاوگ) بۆیان هەیە ڕۆڵی فرێزی ناوی بگێڕن، بەلام لەهەمان کاتدا فرێزی ناوی دەتوانێت ڕۆڵی فرێزی کاریش بگێڕێت (٢ـ٢٧).

١ـ٢ کۆمەڵە ووشەی وەک (نامە ناردن)، کە لە ناوێک و چاوگێک پێکهاتوودو لەگەڵ ئەوەی هەر دوویان سەر بەکۆمەڵەی ناون، کەچی زێتر لا بە لای فرێزی کاری دەکات تا فرێزی ناوی، نامە شوێن کەوتەی (ناردن)ە و هەرگیز شوێن کەوتەی بکەری لێکسیکی نابێت، هەتا لەو بارەشدا، کە بکەری لێکسیکی لەنێو ڕستەدا هەبێت، وەک(دایکی نەشمیل) (نامە ناردن)، لێرە دا بە هۆی پەیدا بوونی بکەری لێکسیکی کۆمەڵە ووشەیەکی نوێ دانەڕێژرا، بەڵکو کۆمەڵە ووشەیەکی دی هاتە پاڵێوە، کە دەتواندرێت ئەم ڕستەیەی ژێرووی لێ دابڕێژێت:

دایکی نەشمیل نامەی نارد.

١ـ٣ کۆمەڵەی ناوی بۆی هەیە لە ڕستەدا لە چەندین دۆخدا خۆی بنوێنێت، بۆ وێنە کۆمەڵە ووشەی (کچە ژیکەڵە)، کە فرێزێکی ناوی پێکهێناوە لەنێو ڕستەدا دەتوانێت لەم دۆخانەی ژێروودا بە کار بێت:

کچە ژیکەڵەکە لەگەڵ پشیلە یاری دەکات (دۆخی سەرکاری).

من کچە ژیکەڵەکە دەناسم (دۆخی بەرکاری ڕاستەوخۆ).

پشیلەکەش لەگەڵ کچە ژیکەڵەکە یاری دەکرد (دۆخی بەرکاری تیان).

من بەلای ماڵی کچە ژیکەڵەکەدا تێپەڕیم (دۆخی خستنەسەر).

ئەگەر لەم ڕستانەی ژووروودا جێناوێکی کەسی جودا لەبرێتی (کچە ژیکەڵە) بەکاربێنین، ئەوا ئەم جێناوەش هەمان ئەم دۆخانەی دەبێت،کە (کچە ژیکەڵەکە) هەیبوو:

ئەو لەگەڵ پشیلە یاری دەکات (دۆخی سەرکاری).

من ئەو دەناسم (دۆخی بەرکاری ڕاستەوخۆ).

پشیلەکەش لەگەڵ ئەودا یاری دەکرد (دۆخی بەرکاری تیان).

من بەلای ماڵی ئەودا تێپەڕیم (دۆخی خستنەسەر).
١ـ٤ لە نێو کۆمەڵەی ناویدا ناو بەشێوەیەکی سەرەکی ڕۆڵی سەرکار دەگێڕێت.
ئەو ناوەی فرێزی ناوی پێک دێنێت بۆی هەیە نیشانەی ناسیاری (ـ ەکە)، نیشانەی نەناسیاری (ـ ێک //ـ یەک //ـ ەک)و نیشانەی کۆ (ـ ان) و نیشانەی ناسیاری و نیشانەی کۆ تێکڕا (ـ ە کان) و هەروا زۆر بە دەگمەنیش نیشانەی نەناسیاری و نیشانەی کۆ تێکڕا (ـ انێک)[٢] ی بە کۆتاییەوە بلکێت:
ف. ن. ـ ناو + نیشانەی ناسیاری /گوڵ+ ـ ە کە پشکوت .
ف. ن. ـ ناو + نیشانەی نەناسیاری/گوڵ + ـ ێک پشکوت.
ف. ن. ـ ناو + نیشانەی کۆ/ گوڵ+ـ ان پشکوتن.
ف. ن. ـ ناو + نیشانەی ناسیاری + نیشانەی کۆ.
گوڵ + ـ ە کە +ـ ان پشکوتن.
ف. ن. ـ ناو + نیشانەی کۆ + نیشانەی نەناسیاری کەس + ـ ان + ێک هاتن، کەس نایانناسێت.
دەور+ ـ ان + ـ ێک بە سەرماندا تێپەڕین، سەخت و ناخۆش و ناهەموار.
١ـ٥ ئەم نیشانانەی ژوورەوە نەبێت تایبەت بێت هەر بە ناوەوە، بەڵکو ئەو بەشانەی دیش، کە سەر بە کۆمەڵەی ناون وەک (ئاوەڵناو و چاوگ)یش لەگەڵ هێندێک لەو نیشانانەدا بەکار دێن:
ف. ن. ـ ناوەڵناو + ـ ەکە// مەزن + ـ ەکە هات.
ف. ن. ـ ناوەڵناو + ـ ێک// مەزن + ـ ێک هات.
ف. ن. ـ + ـ ان// مەزن + ـ ان هاتن.
ف. ن. ـ ناوەڵناو + ـ ەکان// مەزن + ـ ەکان هاتن.
ف. ن. ـ چاوگ + ـ ەکە ـ نووسین + ـ ەکە بنووسە
ف. ن. ـ چاوگ + ـ ێک ـ نووسین ـ ێک بنووسە.
ف. ن. ـ چاوگ + ـ ەکان ـ نووسین + ـ ەکان بنووسن.
١ـ٦ ئەم ڕستانەی ژووروو شێوەی ساکارترین ڕستەی سادەن، کە من

لەمەوبەر بە ڕستەی سادەی نەفرە(١٩٨٦)نێوم بردوون، چونکە بنچە سەرەکێکانی ڕستە پێک دێنن و بە بەشانی سەرەکی ڕستە دەژمێردرێن، هەر ووشەیەکی دی هاوبەشی داڕشتنی ڕستەی سادەی نەفرە بکات، ئەوا ڕستەکە لە ڕووی بەشەکانیەوە زێتر دەکات و فراوانتر، بەڵام ڕۆڵیان لە ڕستەدا ناسەرەکییە، چونکە تەواوکاری هەردوو بەشی سەرەکی ڕستەن.

١ـ٧ فرێزی ناوی بۆی هەیە لە ژمارەیەکی ڕادەبەدەر پێک بێت، کە بە یارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) لێکدەدرێن (١ـ٢١) لە نێو ئەو کۆمەڵە ناوییەدا تەنێ جێناو ئەو بەرفراوانیەی بۆ نییە، کە فرێزی ناوی لە ژمارە دا بێ ژمارە بێت:ـ

ف. ن. ـ ناو + ناو + ناو + ناو ...ـ

شاراو ئەناهیتاو شاوشکاو نیناناو ...ـ هاتن.

ف. ن. ـ ئاوەڵناو + ئاوەڵناو+ ئاوەڵناو ...ـ

گەورە و بچووک و هوردو درشت و ... ـ هاتن.

ف. ن. ـ جێناو + جێناو + جێناو + جێناو...ـ

تۆ و ئەو و ئەمانە و ئەوان و ...ـ هاتن.

ف . ن ـ چاوگ + چاوگ +چاوگ + چاوگ و ... ـ

ئاخافتن ونووسین وچاندن ولێنان و...ـ قەدەغەن.

١ـ٨ فرێزی ناوی دەتوانێت لە بەشە جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵەی ناوی، کە دیسانەوە هەر بە یارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و)دا لێک دەدرێن دابڕێژرێت:

ف. ن.ـ جێناو + ناو + چاوگ و...ـ

من و کتێب وخوێندنەوە و... ـ جووتین.

ف. ن. ـ ناو + جێناو + ئاوەڵناو ... ـ

نیناناو تۆو پیرو مەزن و ... ـ هاتن.

١ـ٩ فرێزی ناوی دەتوانێت برێتی بێت لە فرێزێکی دیارخەری، کە لە کۆمەڵەی ناوی و بەیارمەتی ئامرازی خستنە سەری (ـ ی، ـ ە) لە دیالێکتی کرمانجی نێوەڕاست و(ـ ا، ـ ە، ـ ی، ـ یێ، ـ ێن // ـ ێد//ـ ێت) لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا دابڕێژرێت (١ـ١٢)، (د.

کوردستان موکریانی ١٩٧٨، ١٩٨٦).

ف .ن . ـ ناو+ ناو+ ناو ... ـ

خوداوەندی شاوشکای خووری ـ خوداوەندێکی کوردستانی بوو.

ف .ن . ـ ناو+ ئاوەڵناو+ ناو ... ـ

کچە مەزنەکەی ماڵ ـ بەرە وپیرمان هات.

١ـ١٠ لەو بارانەدا، کە فرێزی ناوی لە تاکە ووشەیەک زێتر بوو و نیشانەکانی ڕێزمانی لەمەوبەر باسکراویان لەگەڵدا هاتبوو، ئەوا شوێنی ئەم نیشانانە بە پێی ئەو بەشانەی کۆمەڵەی ناوی کە فرێزی ناویان دارشتوودو ئەو بەشە ناوەی ڕوڵی سەرکاری گێڕاوە دەگۆڕێت و هەروا ئەو ئامرازە سینتاکسییەی فرێزەکەی پێکهێناوە، بۆ وێنە ئەگەر فرێزی ناوی لە ناوێک زێتر پێکهاتبوو و بە یارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) لێکدرابوون، ئەوا نیشانەی ناسیاری بۆی هەیە بەیەکێکیانەوە، یا بەکۆتایی هەموویانەوە بلکێت:

گوڵ و باخ و ماڵەکە و ... هی منن.

گوڵەکە و باخەکەو ماڵەکەو ... هی منن.

١ـ١١ لەم ڕستانەی پێشوودا ئەو ناوانەی فرێزی ناویان پێکهێناوە لەنێوان خۆیاندا بۆیان هەیە لەو بارەدا نیشانەی ناسیاریان پێوە بلکێت وەیا نەلکێت و جێگەی خۆیان ئاڵ وگۆڕ بکەن، بەبێ ئەوەی دارشتنی سینتاکسی ڕستەکە تێک بچێت:

گوڵ و ماڵ و باخ و ... هی منن.

باخ وگوڵ و ماڵ و ... هی منن.

باخ وگوڵ وماڵەکەو ... هی منن.

ماڵ و گوڵ و باخەکەو ... هی منن.

١ـ١٢ ئەگەر ئامرازی سینتاکسی نێوان بەشەکانی فرێزی ناوی ڕستەکانی پێشوو ئامرازی خستنە سەربوو (١ـ٩) ئەوا نیشانەی ناسیاریشیان هەر لەگەڵ بەکاردێت، بەڵام لەم پێنانەی ژێرەوەدا جیاوازییان دەبێت.

یەکەم ـ هەر تەنێ یەک ناو لە نێو فرێزی ناویدا سەرکاری ڕستە

دەبێت، بە پێچەوانەی (١ــ١٠و١ــ١١)کە ناوەکان هەموو سەرکاری ڕستەن.

دووەم ــ ئەو ناوانەی فرێزی ناوییان پێکهێناوە ناتوانن لەنێو خۆیاندا شوێنیان بگوێزنەوەو شوێنی یەکتر ئاڵ وگۆڕ بکەن.

گوڵی باخی ماڵ ــ ی ... ــ ە کە ی ... هی منە.

* باخی گوڵی ماڵ ــ ی ... ــ ە کە ی ... هی منە.

* ماڵی باخی گوڵ ــ ی ... ــ ە کە ی ... هی منە.

١ــ١٣ ئەو فرێزە ناوییەی، کە بەشەکانی لەناوێک زێتر پێکهاتوون و بەیارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) دارێژرابوون و نیشانەی نەناسیارییان لەگەڵدا بەکار هاتبوو، ئەوا پێڕەوی هەمان یاسای (١ــ١١) دەکات:

گوڵێک و باخێک و ماڵێک و ... هی منن.

باخێک و گوڵێک و ماڵێک و ... هی منن.

ماڵێک و باخێک و گوڵێک و ... هی منن.

هەر هەمان فرێزی ناوی(١ــ١٢) کەبەهۆی ئامرازی خستنەسەردا لێکدراوە، سەرکارە کەی تایبەتێتی ئەوەی دەبێت، بۆ ئەوەی دیارخەرێکی بەپێش بکەوێت، کە بەیارمەتی لێکدەری سینتاکسی فرێزێکی دیارخەری فراوانتر لەنێو خۆیاندا پێک دەهێنن :

چەند گوڵێکی باخی ماڵ ...ی ... هی منە.

هیچ گوڵێکی باخی ماڵ ...ی ... هی من نییە.

## دۆخی فرێزی ناوی

١ــ١٤ فرێزی ناوی لە هەر چ جۆرە بەشی کۆمەڵەی ناوی پێک هاتبێت، دۆخی تایبەتی سینتاکسی خۆی دەبێت، کە هەر دۆخەش ئامرازی تایبەتی و باری تایبەتی خۆی هەیە:ــ

## دۆخی ڕاستەوخۆ و دۆخی تیان

١ــ١٥ فرێزی ناوی بە گشتی هیچ نیشانەیەکی دۆخی پێوە نالکێت وهەروا هیچ جۆرە ئامرازێکیشی بە پێش ناکەوێت، هەر وەکو لەم ڕستانەی لەمەوبەر بەکار هاتوون، کە هەموویان لە دۆخی ڕاستەوخۆ دان، دۆخی ناڕاستەوخۆ زۆر بەدەگمەن بەکاردێت، ئەویش بە ڕێگەی نیشانەی (ــ

ی)بۆ ڕەسەنی نێرو (ـ ێ) بۆ ڕەسەنی مێ، کە بەزۆری لەنێو تێکستی فۆلکلۆریدا پارێزراوە، هەروا لە هێندێک شێوە زاری کرمانجی ژووروو و کرمانجی نێوە ڕاستدا:

پاسەوانێ بانگی کوڕی کرد.

گوڵبەهارێ تێم ڕاما.

ئامرازی (بە) یا (لەلایەن ...ەە) بەپێش بکەر دەکەوێت ولە کاتێکدا بەکار دێت، کە کاری فرێزی ناوی برێتی دەبێت لە کارێکی کارابزر:

ئەم کارە بە شارا دەکرێت.

نامەکە لەلایەن گەوهەرەوە نێردراوە.

### دۆخی بکەری

١ـ١٦ لە دۆخی بکەریدا ڕوودانی ڕووداو بەتەواوی دە کەوێتە سەر بکەر، بەواتا ئەوەی کەبەکارەکە هەڵ دەستێت:ـ

شوان دوێنێ سەری لە ئازادی برای دا.

(شوان)، کە فرێزی ناوی ڕستەی پێشووە و سەرکارە لەدۆخی بکەری دایە و خۆی بە وێستی خۆی کارەکەی ئەنجام داوە، بۆیە جیاوازی هەیە لەگەڵ بکەرێک، کە خۆی ئەنجامی نەداوە:

ماڵ (ـە کە) ڕووخا.

ماڵ بە وێستی خۆی نەڕووخاوە، بەڵام کردەوەکەی پێوە لکاوە، بۆیە لێرەدا دۆخی بکەری دروست ناکات، بەڵام بە گۆڕینێک لە دارشتنی ئەم ڕستەیەدا دەتواندرێت دۆخی بکەری پێک بێت، ئەویش بە گۆڕینی باری ئەو کارەی، کە لەنێو فرێزی کاریدا بەکار هاتووە لە تێنەپەڕەوە بۆ تێپەڕ دەبێت ، کە بە یارمەتی پاشگری (ـ اند) ئەنجام دەدرێت، هەروا لەم بارەی ژوورەوەدا (ماڵ) نابێتە بکەری ڕستە، چونکە کاری پێ ئەنجام نادرێت، بەڵکو ئەو کەسەی کارەکە ئەنجام دەدات، ئەو دەبێتە بکەرو ئەو دۆخی بکەری دروست دەکات:ـ

سەرکەوت ماڵەکەی ڕووخاند.

لەوانەیە خوێنەرەوە بەهوێ ڕستەی (ماڵەکە ڕووخا) وای بۆ بچێت، هەر چ ڕستەیەکی فرێزی کاری لەکارێکی تێنەپەڕ پێک هاتبوو، نەتوانێت

فـــرێزە ناوێکەی لە دۆخی بکەری دابێت، بەڵکو ئەم بارە هەر لەگـــەڵ هێندێـک کـاری تێنەپەڕ ڕوودە دات، بەڵام لە هەمـان کـاتدا لە زمـانی کـوردیدا کاری تێنەپەڕی وا هەن، کە ڕۆڵی فرێزی کاری دەگـێڕن، فـرێزی ناویان لە دۆخی بکەریدا دەبێت:

ئازاد بوو. (بکەر)، لێرە دا بە زۆری ئەم جۆرە ڕستانە بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارێک بەکاردێت، بۆ وێنە: کێ بوو لە دەرگەی دا؟ ئازاد بوو.

ئازاد لە دایک بوو. (سەرکار).

ئازاد بوو. (تەواوکاری کاری فرێزی کاری، کە بکەرەکەی نادیارە و بۆ ـ نەوـ دەگەڕێتەوە).

دۆخی بکەری لە ڕستـەدا لەو بارەشـدا دەبێت، کە کـاری فرێزی کـاری کارێکی تێپەڕ بێت:

ئازاد نامەی نووسی. (بکەری لێکسیکی).

## دۆخی خستنەسەر

١ـ١٧ فرێزی ناوی بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەر (١ـ٩) وەیا بەبێ ئامراز لە دۆخی خستنە سەردا دە بێت (١ـ١٣) کەسەرکـارەکەی هەردەم دەبێتە ناوی دیارخراو لەنێو فرێزی دیارخەریدا:

شاری هەولێر مێژووییە.

جوانترین گوڵ هەڵوەری.






## دۆخی بانگکردن

١ــ ١٨ ئەم دۆخە بە یارمەتی ئامرازی بانگکردن دادەڕێژرێت، کە دەکەوێتە کۆتایی ووشەی بانگ کراوەوە: (ە) بۆ ڕەسەنی نێر و(ێ) بۆ ڕەسەنی مێ، کەبەشێوەیەکی سەرەکی ناوی گشتێن وەک (کوڕ، کچ، خوشک، برا، کاک، ژن، خاڵ، مام):

کوڕە بخوێنە.

کچێ بخوێنە.

دەتواندرێت بە ڕێگەی دەنگەوە، بە بەرزکردن و درێژکردنی ئەم دۆخە دەرببڕێت، جا ووشەی بانگکراو چ ناوی گشتی وە یا ناوی تایبەتی بێت:

کوڕە (سیروان) بخوێنە.

وا ڕێک دەکەوێت، کە هەردوو ووشەی گشتی و ناوە تایبەتیکە پێکڕا بۆ بانگکردن بە کاربێن، ئەوا لەم بارەشدا نیشانەی بانگکردن هەر بە کۆتایی ناوە گشتییەکەوە دەلکێت و هەرگیز ناچێتە سەر ناوی تایبەتی:

کوڕە سیروان بخوێنە.

کچێ ئەشمیل بخوێنە.

هێندێک جار بۆ زێتر بایەخ دان بەو کەسەی، کەبانگ دەکرێت، ناوە بانگکراوە کە دووپات دەکرێتەوە، کە دیسانەوە هەربە ڕێگەی دەنگ بەرزکردنەوە دەبێت:

کوڕە کوڕە بخوێنە.
سیروان سیروان بخوێنە.
لەو بارەدا، کە ووشەی بانگکراو لە یەک کەس زێتر بوو، ئەوا نیشانەکانی بانگکردن هەر دیسانەوە بە کۆتایی ناوە گشتیکەوە دەلکێن، بەڵام (ـ ین) دەکەوێتە پێشیوە، کە نیشانەی کۆیە، لەو بارەدا کاری ووشەی کار لە باری کۆدا دەبێت:
کوڕینە / کچینە بخوێنن.
هەرچەندە تەبایی لەنێوان سەرکارو ووشەی کاردا لە ڕووی نیشانانی مۆرفۆلۆژیوە هەیە:







بەڵام ئەو کەسەی، کە ڕۆڵی سەرکاری بینیوە ئەو هێز بەکردەوەکە هەڵ ئەستاوە، بەڵکو وەکو لە کاری ووشەی کارڕا دیارە قسەکار داوای ڕوودانی کارێک لەو کەسە دەکات کە بانگی کردووە کەواتە ئەوەی کە بەکردەوەیەک هەستابێت، کە ئەویش بانگ کردن و داواکردنە ئەوا ئەو کەسەیە، کەداوا

کارێکەی کردووە، کە لەم جۆرە ڕستانەدا هیچ نیشانەیەکی ڕێزمانی نییە بۆ ژمارەو ڕەسەنی کەسە قسەکارەکە.

## شوێنی سەرکار و
## پێوەندەی بە ووشەی کارەوە

١ــ١٩ لە زمانی کوردیدا سەرکار هەردەم بە پێش ووشەی کار دەکەوێت، جا چ ووشەی کارەکە لە کار پێکهاتبێت، یان لە کۆمەڵەی ناو:

سەربەست هات.

سەربەست براتە.

لە ڕستەی دووەمدا (سەربەست براتە) سەرکارو ووشەی کار دەتوانن شوێنی خۆیان بگۆڕن، کەبە گۆڕینی واتای ڕستەکەش تا ڕادەیەک دەگۆڕێت، بۆ وێنە کەدەڵێین (سەربەست براتە) دوو واتا دەبەخشێت ١)خزمایەتی ٢)لەوانەیە برای دیشی هەبێت، چونکە بەناوێکی گشتی هەواڵی تایبەتی ڕاگەیاندووە، بۆیە داڕشتنی ڕستەکە ڕێ لەوە ناگرێت، کە برای دی هەبێت، بەڵام لەو بارەدا، کەسەرکارو ووشەی کار شوێنی خۆیان ناڵوگۆڕ دەکەن (برات سەربەستە) لە پاڵ ئەوەی هەروەکو ڕستەی پێشوو خزمایەتی دەگەیەنێت، ئەوا لەبەر ئەوەی ووشەی کار ناوێکی تایبەتییە، پێناسەیەکی وا بە سەرکار دەبەخشێت، کە برایەکی دی نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕستەیەی ژوورروو جگە لەم واتایانەی پێشوو واتایەکی دیش دەگەیەنێت، کە جیاوازێکی تەواوی لەگەڵ ڕستەی یەکەمدا هەیە. کە ئەویش واتای ئەوەیە (برات ئازادە).

هێندێک جار بە مەبەستی زێتر بایەخدان بە سەرکار، لە ڕستەدا دووپات دەکرێتەوە:

سەربەست سەربەستی چی پاڵەوانی مەیدان.

سەرکار و ووشەی کار دەتوانن لە ڕستەدا لە ڕووی ووشەو لە ڕووی ماناوە یەک بن:

تۆ تۆیت.

ئەم ڕستەیەی ژووررووواتای ئەوە دەگەیەنێت، کەتۆ لە هیچ بارێکەوە نەگۆڕاویت وهەروەکو خۆت ماویت و دەتواندرێت (تۆ) دووبارە بگرێتەوە،

بە مەبەستی زێتر بایەخ دان بەسەرکار:
تۆ تۆ پاڵەوانی مەیدانیت.
نیشانەی (نە)ی ناکردن، کە دەکەوێتە پێش (تۆ) واتای گۆڕانی باری سەرکار دەبەخشێت و ئەوەی شایەنی باسە (نە) بۆی هەیە بەشداری لە دارشتنی رستەی لێکدراو بکات:
نەتۆ تۆیت، نەمنیش منم.
زۆر بە دەگمەن ووشەی کار بە پێش سەرکار دەکەوێت، ئەویش لە هێندێک باری تایبەتیدا، بەمەبەستی گەیاندنی هێندێک واتای دیاریکراوی وەک شانازی کردن، گەشبینی کردن و رەشبینی کردن:
کوردم من.
بەختەوەرم من.
بێ بەختم من.

## فراوانکردنی فرێزی ناوی

١ــ٢٠ فرێزی ناوی لە چاو فرێزی کاریدا لە بواری فراوانکردنیدا لەلایەن بەشەکانی دی رستەوە کەمتر فراوان دەکرێت.

١ــ٢١ فرێزی ناوی بۆی هەیە نەک هەر لە بکەرێکی لێکسیکی زێتر، بەڵکو لە بکەرێکی لێکسیکی ژمارە بەدەر پێکهاتبێت، کە لەنێو خۆیاندا بە یارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) لێک دەدرێن(١ــ٧)، بەڵام بە دەگمەن لە ئاخاوتنکردن و لە نووسیندا بەم رادە فراوانییەی بەکاردێن وەک:
نەشمیل و ئازاد و شێرکۆ و هەڵۆ و زانا و بەهار و شادان و... نامەیەکیان بۆ نووسەرەکە نووسی.
دەتواندرێت ئەم فرێزە ناوییەی ژووروو، کە لە کۆمەڵێک بکەر پێکهاتووە، هێژ فراوانتری بکەین، بە خستنەسەری دیارخەرێک بۆ هەر یەکێک لە بکەرەکان، کە بەیارمەتی ئامرازی خستنەسەر (١ــ٩)پێک دێت:
نەشمیلی پارێزەرو ئازادی پزشک و شێرکۆی خوشکەزام و هەڵۆی دراوسێ و زانای ژیر و بەهاری رۆژنامەنووس و شادانی لێپرسراو و ... نامەیەکیان بۆ نووسەرەکە نووسی.

ئەم ڕستەیەی ژووروو بۆی هەیە فراوانتر بکرێت بە ڕێگەی خستنە پاڵی دیارخەری دی بۆ سەر دیارخەرەکانی پێش خۆیان، کە بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەر پێکدێن:

ئەشمیلی پارێزەری دادگە و ئازادی پزیشکی نوژداری و شێرکۆی خوشکەزای من و هەڵۆی دراوسێی ئێوە و زانای ژێری فەرمانبەرو بەهاری ڕۆژنامەنووسی دەستگەو شادانی لێپرسراوی گەڕەک و ... نامەیەکیان بۆ نووسەرەکە نووسی.

هەر بکەری ڕستەی ژووروو بۆی هەیە زنجیرەیەک دیارخەری لەگەڵدا بێت:

ئەشیملی پارێزەری دادگەی شاری سلەیمانی و ئازادی پزیشکی نوژداری نەخۆشخانەی سەفین وشێرکۆی خوشکەزای منی مامۆستاو هەڵۆی دراوسێی ئێوەی بەڕێزو زانای ژێری فەرمانبەری شارەوانی و بەهاری ڕۆژنامەنووسی دەستگەی خەبات و شادانی لێپرسراوی گەڕەکی زانیاری و ... نامەیەکیان بۆ نووسەرەکە نووسی.

١ــ٢٢ سەرکاری فرێزی ناویش بۆی هەیە لە ژمارەیەک زێتر بێت و ئەویش بە یارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) لەنێو خۆیدا لێک دەدرێت، بەڵام لە پلەی فراوانیدا ناگاتە ڕادەی فراوانکردنی بکەر:

دەرگەو پەنجەرەو دیوارو مێزوکورسی و ... بۆیە کران.

هەر سەرکارێکی ڕستەی پێشوو بۆی هەیە دیار خەرێکیشی لەگەڵ بێت، کە بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەر دادەڕێژرێت:

دەرگەی دەرەوە و پەنجەرەی سەرەوەو دیواری ناوەوە و مێزی نووسین وکورسی دار و... بۆیە کران.

ئەم فرێزە ناوییەی ژووروو بە هەمان ڕێگەی (١ــ٢١)فروانتر دەکرێت:

دەرگەی دەرەوەی ماڵ و پەنجەرەی سەرەوەی ژووروو و دیواری ناوەوەی خانوو و مێزی نووسینی خڕو کورسی داری گوێز و ... بۆیە کران.

ڕستەی ژووروو جیاوازی لەگەڵ (١ــ٢١) لەوە دایە، کە لەپاڵ ئەم دیارخەرانەش دیارخەری دیش دەتوانێت بە پێش سەرکار بکەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرکاری ڕستەکانی (١ــ٢١) بکەری لێکسیکی ڕستەن و

لە ناوی تایبەتی پێکهاتوون، دیارخەر لەپێش خۆیان وەرناگرن:

دوو دەرگەی دەرەوەی ماڵ و چوار پەنجەرەی سەرەوەی ژووروو و هەموو دیواری دەرەوەی خانوو و یەک مێزی نووسینی خڕو شەش کورسی داری گوێزو ... بۆیەکران.

**١ـ٢٣ ئەگەرچی دیارخەر پێوەندی ڕاستەوخۆی بەکۆمەڵەی ناوەوە هەیە، بەڵام ئەو دیارخەرانەی، کە لە ژمارە و جێناوی چەندی و جێناوی دیار پێکهاتوون ڕۆڵێکی دیاریکراویان لە ڕێک کەوتنی نێوان فرێزی ناوی فرێزی کاریدا هەیە، بە تایبەت لەو بارانەدا، کە بەپێش سەرکاری ڕستە کەوتوون:**

کەسێک هات.

کەسێک خوێندی.



دوو کەس هاتن. چەند کەس هاتن؟
دوو کەس خوێندیان. چەند کەس خوێندیان؟
هەموو کەسم هاتن.
هەموو قوتابی خوێندیان.




ئەگەر هەمان ئەو ژمارەو جێناوانەی ڕستەکانی پێشوو گوێزرانەوەو خرانە دوای بکەرەوە جیاوازیان لەگەڵ یەکدا لەم پنتانەی ژێروودا دەبێت:
١) بکەری لێکسیکی بەیارمەتی ئامرازیُ خستنەسەر دیارخەری لەدوای خۆی وەردەگرێت.
٢) ئەو ژمارە و جێناوانە هیچ ڕۆڵێکیان لەسەر ڕێککەوتنی بکەر لەگەڵ کاردا نابێت.
٣) ژمارەکان و جێناوی چەندی مۆرفیمی بەندی (ـ ە م وـ ە مین) بە

کۆتاییانەوە دەلکێن.

کەسی دووەم هات. کەسی دووەم خوێندی؟

کەسی هەموومان هات. کەسی هەموومان خوێندی.

کەسی چەندەم هات؟ کەسی چەندەم خوێندی؟

ئەوەی شایەنی باسە هەمان ئەم ژمارانەی ژووروو هەروا جێناوەکانیش، کە مۆرفیمی بەندی (ــ ە م وــ ەمین) یان پێوە لکاوە، بۆیان هەیە بکەونە پێش ناوی دیارخراو (بکەر)، بەڵام لەم جۆرە دارشتنانەیاندا هیچ کاریگەرێکیان بەسەر رێکەوتنی نێوان بکەری نێو فرێزی ناوی وکاری نێو فرێزی کاریدا نابێت.

دووەم// دووەمین کەس هات.

دووەم// دوودمین کەس خوێندی.

چەندەم// چەندەمین کەس هات؟

چەندەم //چەندەمین کەس خوێندی؟

١ــ٢٤ ئەو دیارخەرەی، کە دەکەوێتە دوای بکەرێک، کە لە چەند ناوێکی کەسی پێکهاتووە بەیارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) لێکدراون، بۆی هەیە بۆ هەموو بکەرەکان بگەرێتەوە، وەیا هەر تەنێ بۆ بکەری هەرە دوایی (٢ــ٢٩):

زاناو بابان و شنەی پارێزەر لێرەن.



## بەدیارنەکەوتنی سەرکار

١ــ٢٥ بە دیارنەکەوتنی سەرکار یانی هەبوونی ووشەی کار تەنێ لەڕستەدا لە زمانی کوردیدا کارێکی ئاساییە، هەتا ئەگەر ڕستە هەر لە ووشەی کار پێک هاتبێت، ئەوا جێناوی کەسی لکاو، کە بە کۆتایی کاری بەشی کارەوە دەلکێت و کۆتایی کەسیش کەبەکۆتایی ئەو کۆمەڵە ناوەوە دەلکێت، کە ڕۆڵی ووشەی کاری گێڕاوە و کەس و ژمارەی سەرکار دەست نیشان دەکات:

| (ا) | (ب) | (پ) | (ت) |
|---|---|---|---|
| من دێم | دێم | من هاتم | هاتم |
| تۆ دێیت | دێیت | تۆ هاتیت | هاتیت |
| ژاڵە دێت | دێت | ژاڵە هات | هات |
| من و تۆ دێین | دێین | من و تۆ هاتین | هاتین |
| تۆ و زانا دێن | دێن | تۆ و زانا هاتن | هاتن |
| ئەو و تارا دێن | دێن | ئەو و تارا هاتن | هاتن |

ئەو ڕستانەی، کەبەر کۆمەڵەی (ا) و(پ) کەوتوون، لەسەرکارو ووشەی کار پێکهاتوون، بەڵام ئەو ڕستانەی کۆمەڵەی (ب) و(ت) سەرکاریان تێدا بەکار نەهاتووەو بەڵام بەیارمەتی جێناوی کەسی لکاوی (ــ م، ــ ت، ــ یت، ــ ین، ــ ن، ــ ن)، کە بە کۆتایی کاری ڕانەبوردووی تێنەپەڕەوە دەنووسێن و (ــ م، ــ یت، ــ، ین، ــ ن، ــ ن).کە تەنێ بە کۆتایی کاری ڕابوردووی تێنەپەڕدوە دەلکێن، کەس و ژمارەی بکەر دەزاندرێت. لەو کاتانەدا، کە کاری ووشەی کار برێتی دەبێت لە کارێکی تێپەڕ، ئەگەر لە کاتی ڕانەبوردوو بوو ئەوا جێناوی کەسی لکاوی (ــم، یت، ــ یت، ــ ین، ــ ن، ــ ن) بە کۆتایی کارەوە دەلکێن، هەتا لەو بارانەشدا، کە سەرکارو بەرکاریش لە ڕستەدا بن، هەروەکو کاری ڕانەبوردوو و ڕابوردووی تێنەپەر:ـ

من نامە دەنووسم. من دەنووسم. دەنووسم.
تۆ نامە دەنووسیت. تۆ دەنووسیت. دەنووسیت.
ئەو نامە دەنووسێت. ئەو دەنووسێت. دەنووسێت.
ئێمە نامە دەنووسین. ئێمە دەنووسین. دەنووسین.
ئێوە نامە دەنووسن. ئێوە دەنووسن. دەنووسن.
ئەوان نامە دەنووسن. ئەوان دەنووسن. دەنووسن.

١ــ٢٦ ئەگەر ووشەی کار کارێکی ڕابوردووی تێپەڕ بوو ، لە کاتی هەبوون وەیا نەبوونی سەرکار لە ڕستەدا جێناوی کەسی لکاوی (ــم، ــت، ــ ی، ــ مان، ــ تان، ــ یان) بە کۆتایی کارەکەوە دەلکێن هەر وەکو کاری ڕانەبوردووی تێنەپەڕو تێپەڕ:

من نووسیم. نووسیم.
تۆ نووسیت. نووسیت.
ئەو نووسی. نووسی.
ئێمە نووسیمان. نووسیمان.
ئێوە نووسیتان. نووسیتان.
ئەوان نووسییان. نووسییان.

١ــ٢٧ لەو بارەدا کە تەواوکارێک لە فرێزی کاریدا بەکاردێت و کە بە بەرکاری ڕستەکە دەژمێردرێت، ئەوا بە بەکارهاتنی سەرکارو بە بەکار نەهاتنی جێناوە لکاوەکانی (١ــ٢٢) بە بەرکارەوە دەلکێن و لەکاتی بەکار نەهاتنیدا هەمان جێناوە لکاوەکان بە کۆتایی کارەکەوە دەنووسێن و کەس و ژمارەی بکەر لە ڕستەدا دەنوێنن:

من نامەم نووسی. نامەم نووسی. نووسیم.
تۆ نامەت نووسی. نامەت نووسی. نووسیت.
ئەو نامەی نووسی. نامەی نووسی. نووسی.
ئێمە نامەمان نووسی. نامەمان نووسی. نووسیمان.
ئێوە نامەتان نووسی. نامەتان نووسی. نووسیتان.
ئەوان نامەیان نووسی. نامەیان نووسی. نووسییان.

١ــ٢٨ هەروا لەو بارە دا. کە ووشەی کار برێتی دەبێت لەکاری کارا بزر دیسانەوە بکەر بەدیار ناکەوێت، بەرکاری ڕستەکە لە ڕووی شوێنەوەو نەک لەڕووی ئەرکەوە شوێنی سەرکار دەگرێت:



نامەکە دەنووسرێت. دەنووسرێت.
نامەکە نووسرا. نووسرا.
١ــ ٢٩ سەرکاری ڕستە لەو بارەشدا بۆی هەیە لە ڕستەدا بەکار نەیەت، کەووشەی کاری ڕستە برێتی دەبێت لە کۆمەڵەی ناوولەم جۆرە ڕستانەدا کۆتایی کەسی (ــ م،ــ یت،ــ ە،ــ ین،ــ ن،ــ ن)کەس و ژمارەی سەرکار پیشان دەدەن:
من قوتابیم. قوتابیم.
تۆ قوتابییت. قوتابییت.
ئەو قوتابیە. قوتابیە.
ئێمە قوتابیین. قوتابیین.
ئێوە قوتابین. قوتابین.
ئەوان قوتابین. قوتابین.




١ــ ٣٠ ئەو ڕستانەی، کە دەلوێت سەرکاریان تێدا بەکارنەیەت، لەڕووی واتاو داڕشتنەوە دابەش دەکرێنە سەر ئەم جۆرانەی ژێروو:
١) ئەو ڕستانەی، کە باری مرۆڤ دەردەبڕن، وەک:
چاکم. من چاکم.
ماندووم. من ماندووم.
ژیرە. ئەو ژیرە.
٢) ئەو ڕستانەی، کە باری ژینگەو دەوروبەر پیشان دەدەن، وەک:

سارده. ئاوو هەوا سارده.
ڕووناكە. ژوورەكە ڕووناكە.
٣) ئەو ڕستانەی، كە توانای ڕوودانی شتێک دەردەبڕن وەک:
دەبێت. كارەكە دەبێت.
دەشێت. كارەكە دەشێت.
٤) ئەو ڕستانەی ناتوانایی ڕوودانی شتێک دەردەبڕن، وەک:
نابێت. كارەكە نابێت.
٥) ئەو ڕستانەی واتای داواكردن و فەرمان كردن دەبەخشن. وەک:
بخوێنە. تۆ بخوێنە.
بڕۆن. ئێوە بڕۆن.
٦) ئەو ڕستانەی لەشێوەی پرسیار كردنن، وەک:
كەی بگەڕێینە ماڵەوە؟ كەی ئێمە بگەڕێینەوە ماڵەوە؟
دەچنە كوێ؟ ئێوە دەچنە كوێ؟
ئێوە بۆ كوێ دەچن؟

## فرێزی كاری

٢ـ١ كار بە هەموو دەمكاتەكانی بە بنچینەی فرێزی كاری نێو ڕستە دەژمێردرێت.[1]

كار بە تەنێ بۆی هەیە ڕستە دابڕێژێت و واتایەكی تەواو ببەخشێت و بە یارمەتی ئەو بكەرە لكاوەی، كە بە كۆتاییەوە لكاوە، كەس و ژمارەی بكەر دەناسرێت، بۆ وێنە: (دەنووسم) ڕستەیەكی سادەیە و لە (نووس ـ ڕەگی كاری تێپەڕ) و[(ـ م) جێناوی لكاوی كەسی یەكەمی تاک)] داڕێژراوە، لێرە دا كاری (نووسی) هەر تەنێ یەک واتا دەبەخشێت، بەڵام ئەو بابەتەی، كە دەنووسرێت، لەوانەیە (نامە، ووتار، لێكۆڵینەوە، هۆنراوە، وانە، و...) بێت، هەروا ئەو كەرەستەیەی، كە پێی دەنووسرێت (خامە، پاندان، كۆمپیوتەر و...) بێت، وە نەبێت هەموو كارێک لەزمانی كوردیدا هەر تەنێ یەک واتا ببەخشێت، بەڵكو كار هەیە لەیەک واتا زێتر دەبەخشێت، بۆ وێنە (هەڵی دەگەڕێنم) لەگەڵ ئەوەی واتای ئەم دیو ئەو دیو كردن دەبەخشێت، بۆی هەیە واتای دیش بدات بە دەستەوە، هەر وەک

کەسێک لەدژی کەسێکی دی وەیا لە دژی بیرێک یاخی بکەم، هەمان بار لەگەڵ کاری نێو ڕستەی (دەینوێنم) بەرچاو دەکەوێت لەگەڵ ئەوەی واتای نواندنی منداڵ یا کەسێک دەگەیەنێت، لەهەمان کاتدا واتای پێشاندانی کردەوەیەک و نواندنی هەڵوێستێکیش دەبەخشێت (٣).

٢ـ٢ کار گرنگترین بەشی ئاخاوتنە، چونکە لەگەڵ ئەوەی ڕووداو دەردەبڕێت، هاوبەشێکی گرنگی ئەو ئەرکە دەکات، کە پێی سپێرراوەو باسی ئەو ڕووداوە دەکات، کە بکەر ئەنجامی دەدات، یا ئەنجامی داوە، هەروا فەرمانێک، داواکارییەک وەیا سەرسوڕمانێک پێشان دەدات.

٢ـ٣ لەبەر ئەوەی هەبوونی کار لەڕستەدا بۆ پاڵپشت گرتنی سەرکارە. بۆیە سەرکار لەو بارانەدا دەبێتە پاڵدراوی ئەو کارەی، کە ڕۆڵی ووشەی کاری گێڕاوە، ئەوەی شایەنی باسە ئەو فرێزە ناوییەی، کە ڕۆڵی سەرکار دەگێڕێت، بۆی هەیە ڕۆڵی پاڵپشتی یانی ووشەی کاری ڕستەش بگێڕێت (١ـ١).

٢ـ٤ هەر کارێکی فرێزی کاری لە کاتی فراوان کردنیدا بە لایەنی کەمەوە بکەرێکی دەبێت، بەڵام ئەو بکەرە هەرگیز ناچێتە نێو بازنەی فرێزی کارێوە.

٢ـ٥ ئەو کارەی، کەڕۆڵی ووشەی کار لە ڕستەدا دەگێڕێت، هەتا ئەگەر بکەرەکەی لێکسیکیشی نەبێت، ئەوا خۆی بکەرێکی لکاوی پێوە لکاوە، کە کەس و ژمارەی بکەر دەستنیشان دەکات:




٢ـ٦ کار بۆی هەیە ئەم بەشانەی ڕستەی لەگەڵدا بێت:
بکەری جێناوی، کە بە یارمەتی جێناوی لکاو دادەڕێژرێت.
بکەری لێکسیکی، کە بەیارمەتی کۆمەڵەی ناوی (ناو، جێناو،

ئاوەڵناو) پێکهاتووە.
بەرکاری ڕاستە و خۆ و بەرکاری تیان.
ئاوەڵووشەی کار (چۆنیەتی، شوێن، کات، هۆ).
کەواتە لە ڕێگەی تایبەتێتی کاری نێو فرێزی کاریدا لە ڕستەدا لک و پۆپێکی زۆر دەبێتەوەو هەر بەهۆی ئەوەوە دەتواندرێت بەشەکانی دی ڕستە بزاندرێت، بۆیە کار بۆی هەیە بە بنچ و بنەوانی ڕستە بژمێردرێت، هەروەکو دەبینین سەرکاری نێو فرێزی ناویش هەر بە هۆی کارەوە دەزاندرێت و دەگۆڕدرێت.

## فرێزی کاری و دەمکاتەکانی کار

٢ــ٧ کار چەند جۆرە کاتێک پێشان دەدات، وەک: ڕانەبوردوو، کە مەبەستی لەکاتی ئاخافتنە، یا دەمی دادێت، ڕابوردوو، کە کاتی بۆ پێش ئاخاوتن دەگەڕێتەوە، کاری فەرمانکردن ڕووداوەکەی بۆ کاتێکی تایبەتی، ناگەڕێتەوە، بەڵکو واتای کارەکە وا دەگەیەنێت، کە لە داهاتوودا ڕووبدات:




٢ــ٨ دەمکاتی کاری ڕانەبوردوو لەڕووی واتای کارەوە زۆر فراوانە، چونکە بۆی هەیە واتای ڕوودانی کار لەکاتی ئێستە، یانی لەکاتی ئاخاوتن، یا نێزیک وە یا دوور ببەخشێت، بۆ وێنە لە ڕستەی (شارا

دەڕوات) دا هەر سێ واتای کات دەتوانێت خۆی تێدا بنوێنێت : ئێستە، نێزیک و دوور، بەڵام ئەگەر ووشەیەکی دی لەنێو ڕستەکەدا پەیدابوو بۆ ئەوەی کاتی ڕوودانەکە بەشێوەیەکی ڕوونترو ئاشکرا تر پیشان بدات، ئەوا هەرسێ کاتەکە بەم شێوەیەی لاپەڕەی داهاتوو لە هەمان ڕستەدا خۆیان دەنوێنن:

شارا ئێستە دەڕوات. (کاتی ئاخاوتن).

شارا بەیانی دەڕوات. (کاتی داهاتووی نێزیک).

شارا ساڵێکی دی دەڕوات. (کاتی داهاتووی دوور).

٢ــ٩ لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا مۆرفێمێکی بەندی تایبەت هەیە، کە ئەم ئەرکە ڕێزمانییەو واتای ڕوودانی کار لە داهاتوودا دەبەخشێت و ئەم مۆرفێمە بەندە، بە پێش ڕەگی کار دەکەوێت:

ئەز دێ گوهێ خوە دەمە تە پاشی بەینەکی.

٢ــ١٠ لەکاتی بەکار هێنانی کاری ڕانەبوردوو لە ڕستەی تێکەڵی مەرجدا (٢ــ١٤) ئەوە ڕوودانی کارەکە پێوەستە بەڕوودانی کاری نێو ڕستەی شوێن کەوتووی مەرجدا، کەواتە ڕوودانی کارە ڕانەبوردووەکە لە رووی ڕوودان و لە ڕووی کاتدا بەکاری ڕستەی مەرجدا بەندە، بۆیە دەبینین ئەم جۆرە کارە ڕانەبوردووەی، کە لە فرێزی کاری ڕستەی سەرەکی نێو ڕستەی تێکەڵدا خۆی دەنوێنێت کاتی ڕوودانی ڕووداوەکەی بە وەڵامی ڕوودانی کاری ڕستەی مەرجدا پێوەستە، بۆیە نازاندرێت کاتی ڕوودانەکەی ئێستە، داهاتووی نێزیک، یا لە داهاتووی دووردا دەبێت:

ئەگەر تۆ بڕۆیت، منیش دەڕۆم.

کاتی ڕوودانی ڕۆیشتنی من بەکاتی ڕوودانی ڕۆیشتنی تۆوە بەندە، ئەگەرچی کاری (دەڕۆم) بەشداری دارشتنی ڕستەی سەرەکی ڕستەی تێکەڵی مەرجی کردووەو ڕستەیەکی هەواڵگەیەنەری سازکردووە، بەڵام لە ڕووی گەیاندنی هەواڵی کاتی ڕوودانی ڕووداودا کەم و کورتی هەیە، کە ئەویش بۆ کاتی ڕوودانی کاری ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج دەگەڕێتەوە.

٢ــ١١ ئەو کارە ڕانەبوردووەی، کە بە یارمەتی نیشانەی (نا)ی ناکردندا ناکراوە، ڕووداوەکە تێییدا هێژ ڕووی نەداوە، بەڵام لەهەمان کاتدا




دەتوانێت واتای کاتی ئەوە ببەخشێت، کە لەکاتی ئێستە داهاتووی نێزیک وە یا لە داهاتوویەکی دووردا کارەکە ڕوو دەدات و هەروا وەک دەبینین لە هەمان کاتدا بۆی هەیە هیچ کاتێکیش نەبەخشێت:

ئەناهیتا ناخوێنێت.

کاری ناکراوی نێو فرێزی کاری بۆی هەیە واتای ڕوونەدانی ڕووداو بگەیەنێت:

دڵی ئافرەت لەگەڵ تێپەڕ بوونی کاتدا ناگۆڕێت.

٢ـ١٢ کاری ڕانەبوردوو لە نێو فرێزی کاریدا ئەم کات و مەبەستانەی ژێروو دەبەخشێت:

١) ڕوودانی ڕووداو لە کاتی ئاخاوتندا، کە زۆر بە کاردێت و باوە.

هاژە چاوەڕێی دەستگیرانی دەکات.

٢) ڕوودانی ڕووداو لە داهاتوودا چ نێزیک بێت و چ دوور:

بەجێی دەهێڵم و دەبمە کەسێکی نامۆ بۆ ئەو.

٣) خوو ڕەوشتێک، کە یەکێک لەگەڵیدا ڕاهاتبێت:

ژوان هەموو بەیانیەک وەرزش دەکات.

جریوە زوو دەنوێت.

٤) دەربڕینی فاکتی ڕووداوانی سرووشت:

هەور لە هەڵم پەیدا دەبێت.

بەهاران لە کوردستاندا باران زۆر دەبارێت.

٥) ڕووداوێک دەردەبڕێت، کە لە هەموو کاتێکدا ڕوودەدات، بە واتا پێوەندی بە کاتێکی دیاریکراودا نییە:

ماسی لە نێو ئاو دەژیەت.

٢ـ١٣ کاری ڕابوردوو بە هەموو بوارە جۆراو جۆرەکانی کاتیوەی بۆی هەیە لە ڕستەدا ڕۆڵی فرێزی کاری بگێڕێت، بۆ وێنە، کە دەڵێین (من وانەم خوێند) کاری (خوێند) کە کارێکی ڕابوردووی سادەیە، لە ڕووی دەربڕینی ڕوودانی هەمان کاردا لە دەمکاتی ڕابوردووی نێزیکدا جیاوازی هەیەو کاری ڕابوردووی نێزیک نیشانەی تایبەتی ڕێزمانی خۆشی هەیە، کە بە کۆتایی ڕەگی کاری ڕابوردووەوە دەلکێت ( من وانەم خوێندووە) کە لەم جۆرە دارشتنەی کاری ڕابوردوودا وا تێدەگەین، کەوا ڕوودانی کارەکە بەر لە کاتی کسەکردندا بە ماوەیەکی زۆر کەم ڕوویداوە ئەو فرێزە کارییەی، کە کارەکەی بریتییە لە کارێکی ڕابوردووی بەردەوام واتای ڕوودانی ڕووداو لە ڕابوردوودا تا کاتی ئێستە بە بێ پچڕان دەگەیەنێت (من وانەم دەخوێند) کە بە یارمەتی نیشانەی ڕێزمانی (دە ـ) دادەڕێژرێت و بەپێش ڕەگی کاری ڕابوردوو دەکەوێت و لەو بارانەشدا ئەگەر بەرکار لە ڕستەدا نەبوو، ئەوا جێناوی لکاوی کەسی دەکەوێتە نێوان نیشانەکەو ڕەگی کاری ڕابوردوو، (من دەم خوێند) کاتی ڕوودانی کاری ڕابوردووی دوور لەو کاتە بەسەر چووانە دوورترە. کە لەمەوبەر باسم کرد.

کاری ڕابوردووی دوور بە هاوبەشی کردنی کاری (بوو) دادەڕێژرێت، کە دەچێتە سەر ڕەگی کاری ڕابوردووی سادە (من وانەم خوێندبوو).

٢ـ١٤ لە ڕستەی تێکەڵی مەرجدا (٢ـ١٠) کە کاری ڕابوردوو هاوبەشی دارشتنی ڕستەی شوێن کەوتووی مەرج دەکات لەگەڵ ئەوەی کارە ڕابوردووەکە واتای کاتی ڕوودان لە ڕابوردوودا نابەخشێت، هەروا ڕوودانی ڕووداوەکە لە کاتێکی دیاریکراویشدا ناگەیەنێت، ئەگەرچی دارشتنی کارەکە وەک دارشتنی ڕابوردووە، بەڵام بۆی هەیە هەر سێ کاتی ڕوودان (داهاتوو، ڕانەبوردوو و ڕابوردوو) بگەیەنێت.

ئەگەر ڕۆیشت، لەگەڵی دەڕۆم.

لەم ڕستەیەی ژوورەوەدا کسەکار مەبەستی ئەوەیە بڵێت: ئەگەر بڕوات، لەگەڵی دەڕۆم.

٢ـ١٥ لە بەر ڕۆشنایی ئەو بوارانەی کاتی کاری ڕابوردوودا، کاری ڕابوردوو لە فرێزی کاریدا بەم جۆرانەی ژێروو بەکاردێن:




١) ڕوودانی ڕووداو لەکاتێکی نەبسـڕاوتدا، کە لە کاتی کسەکردندا ڕوودەدات و لەگەڵ تەواوکردنی کسەدا تەواو دەبێت:

تادوخیپا لە ژووری تۆ خەوت.

من سوێندم دایت.

بە خودێی مەزنم سپاردیت.

دەوڵەتانی مەزن ئەو بڕیارەیان دا.

ئەوان نامەیان بۆ تۆ نارد.

٢) ڕوودانی ڕووداو لە کـاتێکی ڕابوردووی نێـزیک کـاتی ڕانەبوردوو دەبەخشێت:

ئەم ڕووداوانە بێ هیوایان کردووە.

تادوخیپاو ئەناهیتا دوا کەوتن.

٣) ڕوودانی کـار لە کـاتی ڕابوردوودا و بەردەوام بوونی ڕووداوەکـە تا کاتی کسەکردن:

شاوشکا گوڵی دەکڕی.

ئەناهیتا نامەکانی بۆ دەگەڕاندەوە.

٤) ڕوودانی ڕووداو لە ڕابوردوویەکی دووردا:

قوتابییەکە دوا کەوتبوو، بۆیە بە پەلە بوو.

## کاری تێنەپەڕ لە فرێزی کاریدا

٢ــ١٦ ئەو کــارەی لەڕســـتـــەدا دۆخی بەرکـــاری دروست ناکـــات و کاریگەرێکەی هەر لەسەر بکەر دەبێت، بەکاری تێنەپەڕ دادەندرێت:




٢ــ١٧ لە گەڵ ئەوەی ئەو ڕستـەیەی، کە فـرێزی کـاری برێتـی دەبێت لەکـاری تێنەپەڕ بەرکـاری ڕاستـەو خـۆی لەگـەڵدا نایەت، بەڵام بـۆی هەیە بەرکاری تیانی لەگەڵدا بێت:

منداڵەکە بەشیر تێر بوو.



٢ـ١٨ ئەو فرێزە کارییەی، کە لە کارێکی تێنەپەڕ پێکهاتووە، کارەکەی بۆی هەیە کات و شوێن چۆنیەتی ڕوودانی کارەکەی پیشان بدات:

دوێنێ شەو سروە لەسەربان بەتەنیا نووست.

سروە دوێنێ شەو بەتەنیا لەسەربان نووست.




٢ـ١٩ کاری تێنەپەڕ بە هاوکاری تەواوکارێک ، کە برێتی دەبێت لە کۆمەڵەی ناو دەتوانن تێکڕا ڕۆڵی فرێزی کاری بگێڕن، لەو کارانە، کە ڕۆڵێکی چالاکی هەیە لەم بوارە دا کاری (بوو)ە، کە لە چاو کارانی هەبووندا زێتر بەکاردێت، ئەمەشیان بۆ واتای هەبوونی گشتی کاری (بوو) دەگەڕێتەوە، هەروا توانای تەواوی گەردانکردنی لە کاتی ڕابوردوو و ڕانەبوردوودا هەیە:

سالار پاڵەوان بوو.

٢ـ٢٠ ئەو فرێزە کارییەی، کە لە تەواوکارێک و کارێکی تێنەپەڕ پێکهاتووە، تەنێ دیارخەر بۆی هەیە بکەوێتە نێوانیان:

سالار پاڵەوانی گوند بوو.




۲ــ۲۱ تەواوکاری کاری تێنەپەڕ بۆی هەیە لەگەڵ کاردا جێگۆڕکێ بکات، کە بەیارمەتی نامرازی پێوەندی (بە) دادەڕێژرێت و دەکەوێتە نێوان کارو تەواوکارەکەی، بەڵام لەم بارەدا نامرازو تەواوکارەکە ڕۆڵی بەرکاری تیان دەگێڕن:

سالار بوو بەپاڵەوانی گوند.



ئەم دوو ڕستەیەی ژوورەوە:
سالار پالەوانی گوند بوو.
سالار بوو بە پالەوانی گوند.
هەر چەندە لەڕووی داڕشتنی فرێزی کاریەیان جیاوازن، بەواتا لەڕووکەشەوە، بەلام لە ڕووی واتاوە یەکن.

٢ــ٢٢ هەروەکو دەبینین بەشێوەیەکی گشتی تەواوکاری تێنەپەڕ بەپێش کار دەکەوێت، نەک هەر لەگەڵ کاری (بوو) دا، بەڵکو لەگەڵ هەموو کارێکی تێنەپەڕدا، هێندێک جار ڕێککەوتن و تەباییەک لەنێوان کاری تێپەڕو کاری تێنەپەڕدا دەبینین، هەروەکو ڕێککەوتنی بەکار هاتن لەنێوان کاری (کەوت)ی تێنەپەڕو کاری (کرد)ی تێپەڕ، کە جێگەی یەکتر دەگرنەوە ڕاستە لە ڕواڵەتی دەرەوەیاندا جودان، بەلام لەواتادا یەکن:
شوان بەیانیان دەکەوێتە کار.
شوان بەیانیان کار دەکات.
باڵندەکان کەوتنە فڕکە.
باڵندەکان فڕکەیان کرد.

## کاری تێپەڕ لەفرێزی کاریدا

ئەو ڕستەیەی فرێزی کاری لەکاری تێپەڕ داڕێژراوە، بۆی هەیە دۆخی بەرکاری تێدا هەبێت، بەلام مەرج نییە هەمیشە بەرکار لە ڕستەدا بەکار بێت وەک (من دەنووسم).

کاری تێپەڕ لەوانەیە لە بەرکارێک زێتر بگرێتە خۆی، بەلام هەرتەنێ یەک بەرکاری لەدۆخی ڕاستەوخۆدا دەبێت، ئەوانی دی لە دۆخی تیاندا دەبن. هەروەکو لەم ڕستانەی ژێرەوەدا لە کاری تێپەڕی (گۆڕیوە) دا دەنێین:
سروە لەگەڵ زانا سێوی بەلیمۆ گۆڕیوە.
سروە سێوی لەگەڵ زانا بەلیمۆ گۆڕیوە.
سروە سێوی بە لیمۆ لەگەڵ زانا گۆڕیوە.
سێوی سروە لەگەڵ زانا بە لیمۆ گۆڕیوە.
سێوی لەگەڵ زانا سروە بەلیمۆ گۆڕیوە.

لەم ڕستانەی ژوورەوەدا کاری (گۆڕیوە) چوار بەشی ڕستەی لەگەڵ هاتووە، کە بریتین لە بکەری لێکسیکی و بکەری لکاو، دوو بەرکاری تیان و یەک بەرکاری ڕاستەوخۆ.

هەمان ئەم ڕستانەی ژێروو بۆیان هەیە بەشێکی دیشیان بکەوێتە سەرو بەمەکاری (گۆڕیوە) لە توانایدا دەبێت پێنج بەشی لەگەڵدا بێت، کە بە یارمەتی (بۆ، بەرامبەر) دادەڕێژرێت:

سروە لەگەڵ زانا سێوی بەلیمۆ بۆ درهەمێک گۆڕیوە .

٢ـ٢٤ هەر کارێکی تێپەڕ، کە کۆمەڵەی ناوی وەک ناوو ئاوەڵناوی لەگەڵ دا بێت، بۆ وێنە (سارێژکردن، ڕێ گرتن، پاک کردن، پڕ کردن و...) لە زمانی کوردیدا لە دوو باری سینتاکسیدا خۆی دەنوێنێت بارێکیان دانەیەکی لێکدراوی یەکگرتووە، کەهیچ بەشێکی ڕستە ناکەوێتە نێوانیان جگە لە بکەری لکاو نەبێت، کە لە کاتی بەکارهاتنی بەرکاردا دەکەوێتە نێوانیان:

من خانووەکەم پاککردەوە.




من پاک (م) کردەوە.

لەو بارانەشدا، کە بەرکاری تیان یا هەر بەشێکی دی ناسەرەکی ڕستە بەشداری دارشتنی ڕستە بکات، ئەوا ئەو دانە یەکگرتووەی سینتاکسی

ناو یا ناوەڵناو کە لەگەڵ کاری فرێزی کاریدا پێکیان هێناوە، هەر بە یەکگرتوویی لەنێو ڕستەکەدا دەمێننەوەو بەشێوەیەکی گشتی لێک دانابڕێن:

من بۆ تۆم پاککردەوە.

من خانووەکەم بۆ تۆ پاککردەوە.

دوێنێ من خانووەکەم بۆ تۆ پاککردەوە.

دوێنێ من هەموو خانووەکەم بۆ تۆ پاککردەوە.

دوێنێ من هەموو خانووەکەم بە ناو بۆ تۆ پاککردەوە .

دابڕانی ئەو دانە سینتاکسییەی ژووروو هەر لەو بارەدا دەبێت، کە بکەری لکاو دەکەوێتە نێوانیان، ئەویش لەکاتی بەکارنەهێنانی بەرکاری ڕاستەوخۆو تیاندا دەبێت، کە بکەرە لکاوەکە بە کۆتایی ئەوەوە نووساوە:

من بۆ تۆم پاککردەوە.

من پاکم کردەوە.

پاکم کردەوە.

باری دووەم ئەو دانە سینتاکسییەیە، کە بۆی هەیە وەک دانەیەکی یەکگرتوو خۆی بنوێنێت، وەیا ڕێگە بە بەرکاری تیان دەدات، بۆ ئەوەی بکەوێتە نێوان ئەو فرێزە کارییەی، کە لە ناو ناوەڵناو کارێک پێک



هاتووه:

هاژه دیاری پێشکێش دەکات به تۆ.




هاژه دیاری پێشکێش به تۆ دەکات.



## کاری فەرمان لەفرێزی کاریدا

٢ــ٢٥ کـاری فـەرمـان لە ڕووی ڕووداوە وە لەگـەڵ کـارەکـانـی دیدا جیاوازی هەیە، چونکە لە واتای کات بەدەرە، ئەگەر بەکەسی بەرامبەرمان بڵێین (بنووسە) ئێمە لێرەدا هەر تەنێ داوای کاری نووسینی لێ دەکەین، ئەگەر وەڵامی داخوازێکەی ئێمەی دایەوە، ئەوا کارێک ئەنجام دەدات، کە سەربەخۆیەو پێوەندی بەکاری فەرمانەوە نییە، ئەگەر وەڵامی داخوازێکەی ئێمەی نەدایەوە، ئەوا هیچ کارێکی ئەنجام نەداوە، کەواتە لەهەردوو باردا لەباری وەڵام دانەوەو لەباری وەڵام نەدانەوەشدا کاری فەرمان داخوازێکە بە بێ کـات و هەرگـیـز دەمکاتی فـەرمـان ڕووداني ڕووداو نانوێنێت، بەڵکو واتای ڕووداو دەبەخشـێت لە ڕووی داخـوازێکەی لە ڕسـتـەی (بنووسـە) دا بکەر ئەو کەسەیە، کە فـەرمانەکە دەکات، نەک ئەوەی داوای لێ دەکرێت، کە فەرمانەکە بەجێ بهێنێت، بەڵام هـیچ نیشـانەیەکی ڕێزمانی لەڕسـتـەدا هێما بۆ بکەرە فەرماندارەکە ناکات.

تۆ بنووسە.




## کاری کارا بزر لە فرێزی کاریدا

٢ــ٢٦ فـرێزی کـاری بۆی هەیە برێتـی بێت لە کـارێکی کـارا بزر، کـە لەکاری تێپەڕی ڕابوردوو و ڕانەبوردوو دادەڕێژرێت، کە دەمکات و واتای تایبەتی خۆی دەبێت.

ئەو ڕستـەیەی، کە فـرێزی کاری برێتییە لە کارێکی کارا بزر، لەگەڵ ئەوەی بـکەری لێکســیـکی و ئەو جـێناوانەی، کـە بەکـۆتـایی کـارەوەش

دەلکێن و کەس و ژمارەی بکەر پێشان دەدەن بە بکەری لکاو دادەندرێن، ئەوانیش لە دەست دەچن و لەهەمان کاتدا بەرکاری ڕاستەوخۆشی لەدەست دەچێت و بەرکار لەڕووی شوێنەوە جێگەی بکەری وشەی لەدەست چوو دەگرێتەوە.

ناو نەهێنان و باس نەکردنی بکەر لەوانەیە لە ترسی بکەر، یا بۆ پاراستنی، یان نەناسینی بکەر بێت (ــ ڕا) ئەو نیشانە تایبەتییەیە، کە بەکۆتایی کاری تێپەڕی ڕابوردووەوە دەلکێت و ( ــ ڕێ) ش بە کۆتایی کاری تێپەڕی ڕانەبوردووەوە دەلکێت بۆ دروست کردنی کاری کارا بزری ڕابوردوو و ڕانەبوردوو.

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا کاری (هات) بەشداری داڕشتنی کاری کارا بزر دەکات، کە دەکەوێتە پێش ئەو کارەی کە مەبەستە، هەروا هەمان باریش لە ناوچەی سۆران و موکریانیشدا بەکاردێت:

هاتە برن// هاتە بردن ــ بۆ کاتی ڕابوردوو.

دهێتە برن// دێتە بردن ــ بۆ کاتی ڕانەبوردوو.

ئەو ڕستەیەی، کە فرێزی کاری برێتی دەبێت لە کارێکی تێنەپەڕ لەگەڵ ئەو ڕستەیەی، کە فرێزی کاری برێتی دەبێت لەکاری کارا بزر بەوە لێک دەچن، کەوا کاریگەری هەردوولایان تێپەڕ دەبێتە سەر یەک بەش، وەک ڕستەی (شەونم هات) کاری تێنەپەڕ (هات) تەنێ بکەری لێکسیکی لەگەڵدا هاتووەو کاریگەری لەو تێناپەڕێت، هەتا لەو بارەشدا، کە (هات) لەگەڵ کەسی یەکەم و دووەمی تاک و یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆشدا بەکارهات، ئەوا دیسانەوە هەر بکەری لەگەڵدا دێت، کە ئەویش بکەری لکاوە، لە ڕستەی (نامە نووسرا) دا ئەم ڕستەیەش، کە فرێزی کاری کارێکی کارا بزرە، کاریگەری هەر دیسانەوە تێپەڕبوەتە سەر یەک بەش، کە لە بنچینەدا بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستە بووە (ئازاد نامەی نووسی) ئەم ڕستەیەش لە باری بزری و نابزری کاری فرێزی کاریدا بۆی هەیە بەرکاری تیانیان لەگەڵدا بێت:

ئازاد نامەی بۆ من نووسی.

نامە بۆ من نووسرا.

نامە بۆ من هاتە نووسین.
ئازاد نامە بۆ من دەنووسێت.
نامە بۆ من دەنووسرێت.
نامە بۆ من د(ە) ێتە نووسین.

ئەگەرچی لەم ڕستانەی ژووروودا (نامە) سەرکاری ڕستەیە، بەڵام بکەری لێکسیکی ڕاستەوخۆی ڕستەکە نییە، دەتواندرێت لە هەمان ئەم ڕستانەی ژووروودا، کە فرێزی کاریان لە کاری کارا بزر داڕێژراون، بکەری لێکسیکیش بەشداری بکات، بەڵام نەک بە ڕێگەی ڕاستەوخۆ، بەڵکو بەڕێگەی تیان، کە بە یارمەتی ئامرازی پێوەندی (لە لایەن) دادەڕژرێت و دەکەوێتە پێش بکەرە لێکسیکێکەو لە بکەری لێکسیکی ڕاستەوخۆ دەیکاتە بکەری لێکسیکی ناڕاستەوخۆ:

نامە لە لایەن ئازادەوە بۆ من نووسرا.
نامە لە لایەن ئازادەوە هاتە نووسین.
نامە لەلایەن ئازادەوە دەنووسرێت.
نامە لە لایەن ئازادەوە د(ە)ێتە نووسین.

باوەکو ڕستەکانی پێشوو لە ڕووی ڕواڵەتەوە جیاوازن، بەڵام لەڕووی واتاوە یەکن.

وەنەبێت هەر ئامرازی پێوەندی (لە لایەن) لەگەڵ بکەری لێکسیکیدا لە دۆخی کاری بزربدا بەکاربێت، بەڵکو ئامرازی پێوەندی (بە)ش بە پێش بکەری لێکسیکی ڕاستەو خۆ دەکەوێت و دەیکاتە بکەرێکی لێکسیکی ناڕاستەوخۆ:

دوژمن شکا (شکان).
سوپا دوژمنی شکاند (شکاندن).
دوژمن شکێندرا// هاتە شکاندن.
دوژمن بەهێزی سوپا شکێندرا// هاتە شکاندن.

دەتواندرێت لە ڕستەی هەرە دواییدا لەبرێتی (شکێندرا // هاتە شکاندن)، کە کاری کارا بزری ڕابوردووی تێپەڕن، کاری (شکا)ی ڕابوردووی تێنەپەڕ بەکار بێت:

هێزی سوپا دوژمنی شکاند.

دوژمن بەهێزی سوپا شکا.

دوژمن بەهێزی سوپا شکێندرا.

هەر چەندە ئەم سێ ڕستەیەی ژوورەوە لەڕووی ڕووالەتی دەرەوەیان یانی لەڕووی دارشتنەوە جیان بەلام لەڕووی واتاوە یەکن.

ئەم بارەی چەند جۆرە دارشتنی ڕستە و بەخشینی یەک واتا لەبەکار هێنانی ئەو کارانەدا دەبێت، کە بە یارمەتی (ـ اندن) کراون بە تێپەڕ، وەک ڕووخان ـ ڕووخاندن، جۆشین ـ جۆشاندن، گەیشتن ـ گەیاندن و...

شێوەی دۆخی بزری ـ ستاندارد












## فرێزی ناوی لە رۆڵی فرێزی کاریدا

٢ــ٢٧ ئەو فرێزە کارییەی، کە برێتی دەبێت لە فرێزی ناوی بارێکی چەسپێو بەردەوامی دەبەخشێت ، ئەم جۆرە بارە واتای کاتی ئێستە دەگەیەنێت و ئەو دۆخەی، کە دەری دەبڕێت سیفەتێکی هەمیشەییە .

لە رستەی (مینەواس کوڕمە)، (کوڕمە) فرێزێکی ناویەو دۆخێکی چەسپیو رادەگەیەنێت و لەگەڵ ئەوەی رۆڵی فرێزی کاری گێڕاوە، هەست بەهیچ جۆرە رووداوێک ناکەین تێیدا، هۆیەکەشی بۆ نەبوونی کار لە فرێزەکەدا دەگەڕێتەوە، کە دارشتنەکەشی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

کوڕمە ﹤ ناو (کوڕ) + جێناوی کەسی (ـ م) + کۆتایی کەسی (ـ د).
لەم فرێزە ناوییەی ژووروودا، کە ڕۆڵی فرێزی کاری گێڕاوە،دەزانین، کەوا کاتەکە ئێستەیە و داهاتوو نییە و لە ڕابوردووش نەبووە.

هێندێک لەڕێزمان نووس و شارەزایانی زمانی کوردی ئەو مۆرفێمە بەندانە (ـ م ، ـ یت، ـ ە ، ـ ین ، ـ ن ، ـ ن) کە بە کۆتایی کۆمەڵەی ناوەوە دەلکێن بە کاری یارمەتیدەر یا کاری ناتەواو لە کەلەم داوە، ئەوەی پاڵی پێوە ناون بۆ ئەوەی وای ناو بنێن ئەو بۆ چوونەیە کە دەڵێت ڕستە بەبێ کار نابێت چونکە کار بەردی بناخەی ڕستەیەو ڕستە بۆی هەیە بەبێ بکەری لێکسیکی نێو فرێزی ناوی دابڕێژرێت، چونکە کار بەهۆی ئەو جێناوە لکاوانەی پێوەی دەلکێن ، دەتوانێت کەس و ژمارەی بکەر[٤] بەناسین بدات.

ئەو مۆرفیمە بەندانە، کە بە کۆتایی ئەو کۆمەڵە ناودوە دەلکێن، کە ڕۆڵی فرێزی کاریان گێڕاوە، ئەوانیش هەر کۆتایی کەسین، کە وەکو جێناوی کەسی لکاو کەس و ژمارەی سەرکار دەست نیشان دەکەن.

ئەم کۆتایی کەسیانە لە پێشدا بە کۆتایی ڕەگی کاری ڕابوردووی (هەبوون ﹥ هەبوو[٥]) لکاون و بەرە بەرە ئەم کارە کەمتر بەکار هاتوودو تا بەیەکجاری لەنێو چووە و لە ئەنجامدا کۆتایەکانی لکاون بەو بەشە ناوییەی، کە لەگەڵ کارەکەدا تێکڕا ڕۆڵی فرێزی کاریان گێڕاوە.

ئەم کۆتایی کەسیانە هەر وەکو ئەو جێناوە لکاوانەن، کە بە کۆتایی کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ، ڕانەبوردووی تێنەپەڕ ڕانەبوردووی تێپەڕن چ لە ڕووی شێوە و چ لە ڕووی ئەرکی ڕێزمانیدا.

لە ڕستەی (ژیکەڵە ژنە) دا هەر دەبێت کارێک هەبوبێت، کە کەوتبێتە نێوان (ژن) و کۆتایی کەسی سێیەمی تاک (ـ ە)، کە دارشتنی ڕستەکە بەم شێوەیەی ژێروو دەبێت:

ژیکەڵە ژنە﹤ ژیکەڵە ژن هەیە.

کاری (هەبوون) کە ڕۆڵی فرێزی کاری لە ڕستەدا دەگێڕێت و لەو بارانەدا، کە پێویستە زێتر ڕووناکی بخاتە سەر سەرکار پێویستی بەناوێک دەبێت لەنێو کۆمەڵەی ناویدا بۆ ئەوەی تەواوی بکات و بتوانێت

| کۆتایی کەسی | جێناوی کەسی لکاو | | |
| --- | --- | --- | --- |
| | ڕابوردووی تێنەپەڕ | ڕانەبوردووی تێنەپەڕ | ڕانەبوردووی تێپەڕ |
| ـ م<br>ـ یت<br>ـ ە | ـ م<br>ـ یت<br>ـ ... | ـ م<br>ـ یت<br>ـیت، ات | ـ م<br>ـ یت<br>ـ ات |
| ـ ین<br>ـ ن<br>ـ ن | ـ ین<br>ـ ن<br>ـ ن | ـ ین<br>ـ ن<br>ـ ن | ـ ین<br>ـ ن<br>ـ ن |

ئەم ئەرکە بنوێنێت، هەر وەکو کاری (بوو[٦])، کە ئەویش لە هەمان دۆخی سینتاکسیدا پێویستی بە تەواوکار هەیە:

من نووسەرم ــ من نووسەر هەم.

تۆ ژیریت ــ تۆ ژیر هەیت.

سەردار ئازایە ــ سەردار ئازا هەیە.

ئێمە قوتابیین ــ ئێمە قوتابی هەین.

ئێوە پرۆفیسۆرن ــ ئێوە پرۆفیسۆر هەن.

ئەوان نەمرن ــ ئەوان نەمر هەن.

لە دوو ڕستەی (من هاتم) کە فرێزی کارێکەی برێتییە لە کار و (من نووسەرم) کە فرێزی کارێکەی برێتییە لە فرێزێکی ناوی دەتواندرێت سەرکاری ڕستە بەکار نەیەت و لەنێو بچێت بەبێ ئەوەی واتای ڕستەکە تێک بچێت، چونکە جێناوە لکاوەکەو کۆتایی کەسێکە، کە لە هەردوویاندا(ـ م)کەس و ژمارەی سەرکارە کە دەست نیشان دەکات:

من هاتم ـ هاتم

من نووسەرم ـ نووسەرم.

کۆمەڵەی ناوی لەگەڵ کۆتایی کەسیدا، کە فرێزی ناوی دادەڕێژن و ڕۆڵی فرێزی کاری دەگێڕن، بەم جۆرەی ژێروو ئەم ئەرکە دەبینن[٧] :

١ــ ناو له ڕووی شێوەوە چ سادە بێت و چ نەسادە، ناوی کەسی و هەروا ناوی گشتیش بۆیان هەیە لەگەڵ کۆتایی کەسیدا فرێزی ناوی دابڕێژن و ڕۆڵی فرێزی کاری بگێڕن:

تۆ ژنیت ــ تۆ ژن هەیت ــ ژن هەیت.

ئەو گوڵبەهارە ــ ئەو گوڵبەهار هەیە ــ گوڵبەهار هەیە.

تۆ نەسرینیت ــ تۆ نەسرین هەیت ــ نەسرین هەیت.

ئەوان ژنن ــ ئەوان ژن هەن ــ ژن هەن.

٢ــ جێناوی کەسی جودا ، جێناوی خۆیی، جێناوی نیشانە ، جێناوی پرسیار، جێناوی نادیار، جێناوی دیار و جێناوی ناکردن:

ئەوە ئەوە ــ ئەوە ئەو هەیە ــ ئەو هەیە.

ئەوە خۆمم ــ ئەوە خۆم هەم ــ خۆم هەم

ماڵەکە ئەمەیە ــ ماڵەکە ئەمە هەیە ــ ئەمە هەیە.

ماڵەکە کامەیە ــ ماڵەکە کامە هەیە ــ کامە هەیە.

ئەوە هەندێکە ــ ئەوە هەندێک هەیە ــ هەندێک هەیە.

کارەکە هیچە ــ کارەکە هیچ هەیە ــ هیچ هەیە.

٣ــ ئاوەڵناوی سادە و پلەی بەراورد و پلەی باڵا:

گوڵەکە جوانە ــ گوڵەکە جوان هەیە ــ جوان هەیە.

گوڵە سپیەکە جوانترە ــ گوڵە سپیەکە جوانتر هەیە ــ جوانتر هەیە.

گوڵە سپیەکە جوانتریانە ــ گوڵە سپیەکە جوانترینیان هەیە ــ جوانتریان هەیە.

٤ــ ئاوەڵ ووشەی کاری چۆنیەتی، شوێن، کات و هۆ و...

کارەکە خێرایە ــ کارەکە خێرا هەیە ــ خێرا هەیە.

شلێر لە ماڵەوەیە ــ شلێر لە ماڵەوە هەیە ــ لە ماڵەوە هەیە.

کات شەوە ــ کات شەو هەیە ــ شەو هەیە.

نەخۆشێکەی لە برسانە ــ نەخۆشێکەی لە برسان هەیە ــ لە برسان هەیە.

٥ــ چاوگ لەگەڵ کۆتایی کەسیدا فرێزی ناوی دادەڕێژێت و ڕۆڵی فرێزی کاری دەگێڕێت:

ئاواتمان سەرکەوتنە ــ ئاواتمان سەرکەوتن هەیە ــ سەرکەوتن هەیە.
پیشەیان نووسینە ــ پیشەیان نووسین هەیە ــ نووسین هەیە.

## فراوانکردنی فرێزی کاری

٢ــ٢٨ سادەترین فرێزی کاری لە ڕەگی کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ دادەڕێژرێت ، تەنێ بۆ کەسی سێیەمی تاک (هات) لە(هاتن) ، ئەو هات.
(ڕۆیشت) لە (ڕۆیشتن)، ئەو ڕۆیشت .

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا لەپاڵ (٢ــ٢٨) سادە ترین فرێزی کاری لە ڕەگی کاری ڕابوردووی تێپەڕیش پێکدێت، نەک هەر تەنێ بۆ کەسی سێیەمی تاک، بەڵکو هەمان ڕەگ بۆ هەموو کەسەکان بەکاردێت، بۆیە هەردەم جێناوی کەسی جودا لەگەڵیاندا دێت:

من نڤیسی.
تە نڤیسی.
وی/ وێ نڤیسی.
مە نڤیسی.
وە نڤیسی.
وان نڤیسی.

فرێزی کاری لە جۆری فراوانکردنیدا دەوڵەمەندترە تا جۆری فراوانکردنی فرێزی ناوی(١ــ٢٠).

فرێزێکی کاری ، کە بۆ وێنە لە ڕەگی کاری ڕابوردوو و ڕانەبوردووی (کەوتن) داڕێژرابێت، بەم جۆرە و بەم ڕەگەزانەی ژێرەوەی فراوان دەکرێت:

١ــ یەکەمین ڕەگەزێکی کە فرێزی کاری فراوان دەکات بکەری لکاوە، کە بە کۆتایی ڕەگی کاری ڕابوردوو و ڕانەبوردوویەوە دەلکێت (جگە لە کەسی سێیەمی تاکی ڕابوردوو، کە هیچ جێناوێکی کەسی لکاوی پێوە نالکێت:

کەوت+ ــ م (= کەوتم).
کەوت + ــ یت ( = کەوتیت).
کەوت+ ــ .(= کەوت).
کەوت+ ــ ین(= کەوتین).

کەوت+ ـ ن( = کەوتن).
کەوت + ـ ن (= کەوتن).




دە+کەو + ـ م(= دەکەوم).
دە+کەو + ـ یت(= دەکەویت).
دە+کەو + ـ ێت(= دەکەوێت).
دە+کەو + ـ ین(= دەکەوین).
دە+کەو + ـ ن(= دەکەون).




٢ـ بکەری لێکسیکی، کە هەردەم بە پێش فرێزی کاری دەکەوێت، هەرچەندە ناکەوێتە نێو بازنەی فرێزی کارێوە وەک بکەری لکاو، بەڵام ڕستەکە فراوان دەکات:

من کەوتم.
ئێمە کەوتین.
من دەکەوم.
ئێمە دەکەوین.
٣ـ فرێزی کاری بۆی هەیە فراوانتر بکرێت، بە ڕێگەی مەبەستی




زانینی کاتی ڕوودانی ڕووداوەکە، کە ڕاستەو خۆ بە فرێزی کاریەوە بەندە:
من دوێنێ کەوتم.
دوێنێ من کەوتم.
ئێمە دوێنێ کەوتین.
دوێنێ ئێمە کەوتین.
من سبەی دەکەوم.
سبەی من دەکەوم.
ئێمە سبەی دەکەوین.
سبەی ئێمە دەکەوین.
٤ـ بە نیازی زانینی شوێنی ڕوودانی ڕووداوەکە فرێزی کاری دیسانەوە فراوانتر دەکرێت، کە ئەویش هەر یەکسەر بۆ فرێزی کاری دەگەڕێتەوە:
من دوێنێ لە ڕێگە کەوتم.
دوێنێ من لە ڕێگە کەوتم.
ئێمە دوێنێ لە ڕێگە کەوتین.







دوێنێ ئێمە لە ڕێگە کەوتین.
من سبەی لە ڕێگە دەکەوم.
سبەی من لە ڕێگە دەکەوم.
ئێمە سبەی لە ڕێگە دەکەوین.
سبەی ئێمە لە ڕێگە دەکەوین.

٥ـ بۆ زانینی هۆی ڕوودانی ڕووداوی ڕستەی ژوورەوە فرێزی کاری فراوانتر دەکرێت، کە ئەویش هەر دەکەوێتە نێو بازنەی فرێزی کارێوە و بە ئاوەڵ ووشەی کاری هۆ نێو دەبرێت:

من دوێنێ لە ڕێگە لە بلەزی کەوتم.
دوێنێ من لە ڕێگە لە بلەزی کەوتم.
ئێمە دوێنێ لە ڕێگە لە بلەزی کەوتین.
دوێنێ ئێمە لە ڕێگە لە بلەزی کەوتین.
من سبەی لە ڕێگە لە بلەزی دەکەوم.
سبەی من لە ڕێگە لە بلەزی دەکەوم.
ئێمە سبەی لە ڕێگە لە بلەزی دەکەوین.
٦ــ فـرێزی کـاری پنتی (٥) هێـز مـاوەی فـراوانکردنی هەیە، بە




ڕوونکردنەوەی کاریگەری ڕووداوەکە بۆ سەر چی، کە بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە دوای ووشەی کاردوە و لە هەمان کاتدا بۆی هەیە بکەوێتە پێش ووشەی کاردوە:
من دوێنێ لە ڕێگە لە بلەزی کەوتمە سەر ئەژنۆم.
من دوێنێ لە ڕێگە لە بلەزی لە سەر ئەژنۆم کەوتم.
دوێنێ من لە ڕێگە لەبلەزی کەوتمە سەر ئەژنۆم .
دوێنێ من لە ڕێگە لە بلەزی لەسەر ئەژنۆم کەوتم.
من سبەینێ لە ڕێگە لە بلەزی دەکەومە سەر ئەژنۆم.
من سبەینێ لە ڕێگە لە بلەزی لەسەر ئەژنۆم دەکەوم.
سبەینێ من لە ڕێگە لە بلەزی دەکەومە سەر ئەژنۆم .
سبەینێ من لە ڕێگە لە بلەزی لەسەر ئەژنۆم دەکەوم.
ئێمە دوێنێ لە ڕێگە لە بلەزی کەوتینە سەر ئەژنۆمان.

ئێمە دوێنێ لە ڕێگە لە بلەزی لەسەر ئەژنۆمان کەوتین.
دوێنێ ئێمە لە ڕێگە لە بلەزی کەوتینە سەر ئەژنۆمان.
ئێمە سبەی لە ڕێگە لە بلەزی دەکەوینە سەر ئەژنۆمان.
ئێمە سبەی لە ڕێگە لە بلەزی لەسەر ئەژنۆمان دەکەوین.
سبەی ئێمە لە ڕێگە لە بلەزی دەکەوینە سەر ئەژنۆمان.
سبەی ئێمە لە ڕێگە لە بلەزی لە سەر ئەژنۆمان دەکەوین.
لە ڕستەی پنتی(١ـ٦) هەر فرێزێکی ناوی بۆی هەیە تەواوکارێکی




لەگەڵدا بێت، کە بە شێوەیەکی سەرەکی دیارخەرە، دیارخەریش بۆی هەیە دانەیەک بێت وەیا زنجیرەیەک دیارخەر بێت، بەڵام هەرگیز ئەم دیارخەرانە ناکەونە نێو بازنەی فرێزی کارێوە، بەڵکو هەر بەو فرێزە ناوێوە بەندن کە بۆی دەگەڕێنەوە:
ـمنی بە توانا دوێنێ ئێوارە لە ڕێگەی شار لە بلەزی ڕۆیشتن کەوتمە سەر ئەژنۆی خۆم.
لە کاتی گۆڕینی (کەوتن) بە کارێکی تێپەڕ ئەوە فرێزی کاری لە چاو فرێزە کارێکەی ڕستەکانی پنتی(١ـ٦) هێژ فراوانتر دەبێت. چونکە ڕەگی کاری تێپەڕ بۆی هەیە بەرکاری ڕاستەوخۆ بەرکاری تیانیش وەربگرێت، هەلبەت لە پاڵ ئەو تەواو کارانەی، کە لە ڕستەکانی پێشوودا خرابوونە سەر فرێزی کاری:
من دوێنێ لە ڕێگە بە بلەز تەلەفۆنم بۆ تۆ کرد.
من دوێنێ لەڕێگە بە بلەز تەلەفۆنم کرد بۆ تۆ.

دوێنێ من لە ڕێگە بە بلەز تەلەفۆنم بۆ تۆ کرد.

دوێنێ من لە ڕێگە بە بلەز تەلەفۆنم کرد بۆ تۆ.

ئەم ڕستانەی ژوورووش بۆیان هەیە بە ڕێگەی دیارخەرێک وەیا زنجیرەیەک دیارخەرەوە فراوانتر بکرێن، بەڵام ناچنە نێو بازنەی فرێزی کارێوە:

منی بە توانا لە ڕێگەی شار زۆر بلەز تەلەفۆنێکی کورتم بۆ تۆی هێژا کرد.

**٢ـ٢٩** لەو بارانەدا، کە بەرکاری ڕاستەوخۆو بەرکاری تیان برێتی دەبن لە کۆمەڵێک ناوی کەسی و بەیارمەتی ئامرازی بەستنەوەی (و) لێکدە درێن. کە بە خستنە پاڵی دیارخەرێک فراوانتر دەکرێن، دیارخەرەکە بۆی هەیە بۆ هەموو بەردکان بگەڕێتەوە وەیا بۆ بەرکاری هەرە دوایی(١ـ٢٤):

هەڵۆ زانا و بابان و شنەی پارێزەری دیت.

**٢ـ٣٠** ئەو ڕستەیەی فرێزە کارێکەی لە فرێزی ناوی و ووشەی کار




هەڵۆ نامەی بۆ زاناو بابان و شنەی پارێزەر نارد




پێکهاتووە، فرێزی ناوی فرێزە کارێکە بە یارمەتی دیارخەر فراوان دەکرێت، بەڵام ئەم فراوانکردنە بەر کاری ووشەی کارەکە ناکەوێت:

پیاوەکە مەزن بوو.

پیاوەکە مەزنی دێ بوو.

پیاوەکە مەزنی دێی پیرکۆت بوو.



## لە نێوچوونی کار

٢ــ٣١ هەروەکو لە بابەتەکانی ژوورەوودا دیارە ڕستە لە زمانی کوردیدا بە بێ کار دانارێژرێت، تەنێ لەو بارە دا نەبێت، کە ڕەگی کاری ڕانەبوردوو (هـ)ی(هەبوون) لە ڕستەدا بەکارنایەت، لە پاڵ ئەو بارەشدا هێندێک دەربڕینی وا ڕوون و ئاشکرا هەن کە کسەکار پێویستی بە بەکار هێنانی کار نییە و گوێگریش لێی تێ دەگات، یا کار لە نێو ڕستەدا لەبەر هێندێک باری زمانەوانی لە ڕستەدا بەکار نایەت، هەروەکو لەم پێتانەی ژێرەوودا ڕوون کراونەتەوە:

١ــ لە وەڵام دانەوەی پرسیاردا:

کێ هات؟ شلێر.

نامەکەت خوێندەوە؟ بەڵێ.

٢ــ بە شان و باڵی یەکێک هەڵدان، یا توانج گرتن:

دایک مامۆستا و باوک ئەندازیار.

٣ــ لە باری ئاگادار کردندا:

ئاگر... ئاگر...

٤ــ لە باری ڕاگەیاندن و هۆشیارکردنەوە دا:

خوشکت... خوشکت...

٥ــ لە باری هەستی ناخۆشی دەربڕین و نزاکردن:

بەداخەوە.

هەی بێ بەخت خۆت.

هەی کلۆڵ خۆت ژن.

مەگەر هەر خودا.

٦ــ لە باری لێکچواندندا:

وەکو گوڵ.

وەک دەنگی بولبول.

٧ــ لە باری جێ بە جێ کردنی هەر کارێکدا:

بەسەر چاو.

٨ــ لە باری پێزانین:

سوپاس.
٩ـ لەباری ڕێگەی ئەنجام دانی کار:
بە دەست.
بە چەقۆ.
بە پۆستە.
١٠ـ لە کاتی دەست نیشان کردنی کات و شوێن:
لە سەرمای زستان.
بە شەو.
لە ماڵەوە.
لە نێو زانکۆدا.

## شوێنی فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە نێو ڕستەی کوردیدا

٣ـ١ فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە ڕووی ئەو ئەرکە سینتاکسییەی، کە لە نێو ڕستەدا دەیگێڕن هەر لە نێو پێکهاتنی خۆیاندا دابەش دەکرێنە سەر دوو بەش:ـ

یەکەم ـ بەشە سەرەکیێکانی فرێزی ناوی فرێزی کاری: ئەو دوو بەشە بنجییە دەگرنەوە، کە هەردوو فرێزی ناوی و کاری بە شێوەیەکی سەرەکی لە وان پێک دێن:

١ـ سەرکار//(نیهاد ـ Subject).
٢ـ ووشەی کار//(گوزارە ـ Predicate).

دووەم ـ بەشە ناسەرەکیێکانی فرێزی ناوی و فرێزی کاری: ئەو بەشانەن، کە تەواوکاری هەردوو بەشە سەرەکیێکە فرێزی ناوی و فرێزی کارین و هەر یەکەیان ڕۆڵی سینتاکسی تایبەتی خۆیان هەیە لە ڕستەدا:

١ـ بەرکار(Object).
٢ـ دیارخەر(Attributive).
٣ـ ئاوەڵ ووشەی کار( Adverbial).

٣ـ٢ لە نێو ئەم بەشانەی ڕستەدا ووشەی کار بە بنکەی دارشتنی سەرەکی ڕستە دەژمێردرێت و سەرکارو بەشە ناسەرەکیێکانی ڕستە هەرگیز

بەبێ ووشەی کار ناتوانن ڕستە دابڕێژن، تەنێ لەو بارانەدا نەبێت کە ل (٢ـ٢٧)و(٢ـ٣١)دا باسکراون.

ئەم خشتەیەی ژێروو فریزی ناوی و فریزی کاری تەواوکارەکانیشی خستۆتە ڕوو:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| نارد | | | | | |
| نارد | ـم | | | | |
| من | ناردم | | | | |
| من | نامەم | نارد | | | |
| من | دوێنێ | نامەم | نارد | | |
| من | دوێنێ | خێرا | نامەم | نارد | |
| من | دوێنێ | خێرا | نامەیەکی | کورتم | نارد |

٣ـ٣ لەم خشتەیەی ژوورەوودا ئەوە بە دیار دەکەوێت، کەوا سەرکار، کە بەشی بنجی فریزی ناوییە کەوتۆتە سەرەتا و ووشەی کاریش، کە بەشی بنجی فریزی کارییە کەوتۆتە کۆتایی ڕستەوە و تەواوکارەکانی بەشە بنجێکانیان.کە بە بەشی ناسەرەکێکانی هەردوو فریزی ناوی و فریزی کاری دەژمێردرێن کەوتوونەتە نێوانیان.

٣ـ٤ مەرج نییە هەمیشە سەرکار بکەوێتە سەرەتای ڕستە و ووشەی کاریش لە کۆتای ڕستەدا بێت، چونکە هێندێک جار تەواوکارەکانی بەشە سەردکێکانی فریزی ناوی و فریزی کاری لە نێو ڕستەدا شوێنی خۆیان دەگوێزنەوە و دەکەونە سەردتا وەیا کۆتایی ڕستەوە، بەڵام هەبوونی ئەم تەواوکارانە لە سەرەتا و کۆتایی ڕستەدا هەرگیز ئەو یاسایە ناگۆڕن، کە هەردەم سەرکار بە پێش ووشەی کار کەوتووە، ئەمە لە کاتێکدا، کە هەردوویان لە ڕستەدا هەبووبن، چ لەگەڵ هەبوونی تەواوکارەکانیان و چ لە باری نەبوونیاندا(بڕوانە پاشکۆی ژمارە١):

لە بەرزترین نهۆمی ئاسماندا ئەناهیتا ئارامی گرتبوو.

دوژمنی کورد کەوتە سەر ئەژنۆ.

**٣ـ٥** سادەترین ڕستەی کوردی بۆی هەیە، تەنێ لە فرێزی کاری پێک بێت و سەرکاری فرێزی ناوی، کە بە بەشێکی بنجی ڕستە دەژمێردرێت لە ڕستەدا نەبێت، چونکە ووشەی کار ئەگەرچی لە نێو ڕستەدا وەکو کارێکی سادە ڕۆڵی خۆی دەگێرێت، بەڵام سادە نییە و لە تاکە مۆرفیمێک پێک نەهاتووە و بەڵکو لە دوو مۆرفیم کەمتر نییە و زێتر هەیە تەنێ کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ بۆ کەسی سێیەمی تاک لە دیالێکتی کرمانجی نێوەڕاستدا، کە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا ڕەگی کاری ڕابووردووی تێپەڕیشی دێتە سەر، کە یەکێک لەو مۆرفیمانە ئەو جێ ناوە لکاوانەن، کە لەگەڵ ڕەگی کاردا دێن و کەس و ژمارەی بکەر پێشان دەدەن و بە بکەری لکاوی ڕستە دەژمێردرێن بۆیە نەبوونی سەرکار لە نێو ڕستەدا یاسای ڕستەیی لە دەست ناخات:

١ـ نووسیم ـ نووس + م = ڕەگی کاری ڕابوردوو + جێ ناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاک.

٢ـ دەگرن ـ دە + گر + ن = نیشانەی داهاتوو + ڕەگی کاری ڕانەبوردوو + جێ ناوی لکاوی کەسی دووەم و سێیەمی کۆ.

**٣ـ٦** ووشەی کار لە پاڵ ئەوەی ئەو جێ ناوە لکاوەی لەگەڵدا دێت، کە کەس و ژمارەی سەرکار پێشان دەدات، بۆی هەیە جێ ناوی لکاوی جۆرێکی دی کۆمەڵە جێ ناوی لەگەڵدا بێت، کە ئەمەیان ڕۆڵی بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەگێرێت:

نووسیمن//من (ئێوە) یا (ئەوان)م نووسی. نووسی ـ ڕەگی کاری ڕابوردووە.

ـ م ـ جێ ناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکە لە گروپی (ـ م، ـ ت، ـ ی،ـ مان،ـ تان ، ـ یان)ە، کە کەس و ژمارەی سەرکار پێشان دەدات.

ـ ن ـ جێ ناوی لکاوە و بەرکاری ناڕاستەوخۆیەو بۆ گروپی (ـ م، ـ یت، ـ یت/ ات، ـ ین، ـ ن، ـ ن) دەگەڕێتەوە.

ئەوەی شایەنی باسە هەرگیز دوو جێ ناوی لکاوی یەک گروپ لەگەڵ ڕەگی کاردا پێکەوە بەکار نایەن.




٣ـ٧ لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا ڕستەی چۆن باری یەکەم داناڕێژرێت، لەم دیالێکتەدا جێناوی لکاوی گروپی(ــ م، ــ ت، ــ ی، ــ مان، ــ تان، ــ یان) نین و جێ ناوی کەسی دۆخی خاوەنی (من، تە، وی/وێ، مەوە، وان) بە پێش ڕەگی کاری ڕابوردوو دەکەوێت:ــ

من، تە، وی/ وێ بۆ تاک ــ نڤیسی

مە، وە، وان بۆ کۆ ــ نڤیسی

٣ ــ٨ شوێنی بکەری لکاو لە نێو ئەو ڕستەیەی کە تەنێ لە ووشەی کار پێکهاتووە و بە پێش یا بە پاش ڕەگی کار دەکەوێت، هەرگیز شوێنی ئەم جێ ناوانە لەو کاتانەدا ناگۆڕێت، کە نیشانەی ڕێزمانی دی لەگەڵدا دێت:ــ

دەگرم ــ کاتی ڕانەبوردوو.

گرتم ــ کاتی ڕابوردووی سادە.

دەمگرت ــ کاتی رابوردووی بەر دەوام.

نەمگرت ــ کاتی ڕابوردووی ناکراو.

گرتبووم ــ کاتی ڕابوردووی دوور.

نەمگرتبوو ــ کاتی ڕابوردووی دووری ناکراو.

مەگرە ــ ناکردن.

بگرە ــ فەرمان کردن.

بمگرتایە ــ لە بارەی ئیلزامی.

تاکە دۆخێکی ناوێزە لێرەدا دەمکاتی ئەگەری ڕوودانە لە ڕابوردوودا، کە نیشانەی (ب) دەکەوێتە نێوان ڕەگی کاری ڕابوردوو و جێناوی لکاودوە وەک:

کەوتبم، کەوتبووبام.

٣ـ٩ لە زمانی کوردیدا تەواوکارەکانی فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە ڕستەدا بە شێوەیەکی گشتی دەکەونە نێوان سەرکار و ووشەی کاردوە.

بەرکار ئەو تەواوکارەی فرێزی کارییە، کە کاریگەری ڕوودانی ڕووداو بە سەر چی و بەسەر کێدا پێشان دەدات و جۆرەکانی ئاوەڵ ووشەی کار شوێن، کات، هۆ و چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداو ڕوون دەکەنەوە بۆیە پێوەندی یەکسەریان بە ووشەی کاردوە هەیە و بۆ ئەو دەگەڕێنەوە لە ڕووی شوێنەوەش لەوەوە نێزیکن، بەڵام دیارخەر، کە بۆ زێتر بە دیارخستنی سەرکار، بەرکار، ئاوەڵ ووشەی کارو بەشی ناوی ووشەی کار ڕۆڵ دەگێرێت، بۆیە پێوەندی ڕاستەوخۆی بەوانەوە هەیە، نەک بە کاری ووشەی کار:ـ

ڕێبەرانی کورد بەرهەمی خەباتی کورد کۆبکەنەوە.



ژنی کورد بەستەم دەورە دراوە.




پەنابەرانی کورد لە وولات دوورن.



کەرکوک لە شەوی نەورۆزی ساڵی ١٩٩١دا ئازاد کرا.




قەرە فاتمە ئازایانە دەجەنگا.



ژن لە پێناو یەکسانیدا ڕۆڵی دیاریکراوی خۆی دەگێڕێت.




خووریبیان بەنێو بانگترین گروپی زمانەوانی کولتووری سەربەخۆی وولاتی کوردەواری بوون.



## بەشەکانی ڕستە لە سەرەتای ڕستەدا

٣ـ١٠ بە شێوەیەکی گشتی سەرکار دەکەوێتە سەرەتای ڕستەوە:

کورد دەوڵەتی سەربەخۆی دەوێت.

خووری(هووری) زمانێکی کۆنی کوردستانییە.




٣ـ١١ هەموو بەشەکانی دی ڕستە دەتوانن بکەونە سەرەتای ڕستەوە، بەڵام بە پێی ئەو هەل و مەرجانەی لە نێو ڕستەدا بۆیان دەڕەخسێت، بۆ وێنە ووشەی کار تەنێ لەو بارانەدا دەکەوێتە سەرەتای ڕستە، کە سەرکار و بەرکاری ڕاستەوخۆ لە نێو ڕستەدا باس نەکرابن:

گەڕایەوە وولاتی دێرینی خۆی.



ناردمەوە بۆ تۆی زانا و دڵسۆز.

**٣ـ١٢ بەرکاریش کاتێک شوێنی سەرەتای ڕستەی بەردەکەوێت، کە سەرکاری ڕستە لە نێو ڕستەدا نەبێت و تەنێ بە هۆی بکەری لکاوەوە دەربڕابێت، کە لەگەڵ ووشەی کاردا هاتووە:**

**مۆژدەی ڕزگاری کوردی بۆم هێنا.**




**بۆم چاپ بکە.**

**٤ـ١٢ دیارخەر ئەو کاتە بۆی دەلوێت بکەوێتە سەرەتای ڕستەوە، کە بە پێش ناوی دیارخراو کەوتبێت و ناوە دیارخراوەکەش ڕۆڵی سەرکاری ڕستە وەیا بەرکاری ڕستەی گێڕابێت:**



جوانترین گوڵی بۆم هەڵبژارد.




جوانترین گوڵ پشکووت.

۳ــ۱٤ هەموو جۆرەکانی ئاوەڵ ووشەی کار بۆیان هەیە بکەونە سەرەتای ڕستەوە. هەتا لە باری بەشداربوونی هەموو بەشەکانی دی ڕستە لە داڕشتنی ڕستەدا.

لە مانگی ڕابوردوودا ئاشتیانە کێشەی خۆیان چارەسەرکرد(ئاوەڵ ووشەی کاری کات).

لە سۆراندا خانزاد ڕێبەری کورد بوو (ئاوەڵ ووشەی کاری شوێن).

خێرا ژنانی کورد نامەیەکیان بۆ سەرۆکانی کورد نارد (ئاوەڵ ووشەی کاری چۆنیەتی).

لە ترسان وولاتی خۆی جێ هێشت (ئاوەڵ ووشەی کاری هۆ).

**بەشەکانی ڕستە لە کۆتایی ڕستەدا**

۳ــ۱٥ لە ڕستەی کوردیدا ووشەی کار بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە کۆتایی ڕستەوە، هەتا ئەگەر هەموو بەشەکانی دی ڕستەش هاوبەشی داڕشتنی ڕستەکەیان کردبێت:

گەوهەر پار لە هەولێرەوە خێرا نامەیەکی کورتی بۆ من نارد.

لە نێو بەشە ناسەرەکیەکانی ڕستەدا جۆرەکانی ئاوەڵ ووشەی کار چۆن بۆیان هەیە بکەونە سەرەتا هەروا نێوان سەرکار و ووشەی کارەوە لە هەمان کاتدا دەتوانن بگوێزرێنەوە بۆ کۆتایی ڕستە. کە لە نێویاندا ئاوەڵ ووشەی کاری شوێن لە کۆتایی ڕستەدا زێتر بەکار دێت، تا جۆرەکانی دی:

گەوهەر نامەیەکی لە هەولێرەوە ناردە هەیرن فەین (ئاوەڵ ووشەی کاری

شوێن).
گەوهەر نامەیەکی لە هەولێرەوە بۆ هەیرن فەین نارد.
ئێمە بۆ بەغدا دوور خرابووینەوە پێنج ساڵ(ان) (ئاوەڵ ووشەی کاری کات).
ئێمە پێنج ساڵ (ان) بۆ بەغدا دوور خرابووینەوە.
گەلاوێژ بە کۆڵانە تەنگەبەرەکەدا ڕۆیشت خێرا (ئاوەڵ ووشەی کاری چۆنیەتی).
گەلاوێژ خێرا بە کۆڵانە تەنگەبەرەکەدا ڕۆیشت.
گەلاوێژ بەکۆڵانە تەنگەبەرەکەدا خێرا ڕۆیشت.
منداڵەکە هەڵدەلەرزی لە سەرمان (ئاوەڵ ووشەی کاری کات).
لەسەرمان منداڵەکە هەڵدەلەرزی.
منداڵەکە لە سەرمان هەڵدەلەرزی.
**٣ـ١٦** بەرکاری تیان هەروەکو دەکەوێتە نێوان بەشە سەرەکیەکانی ڕستە لە کۆتایی ڕستەشدا بەکاردێت:
پرۆفیسۆر زدرێ دوا بەرهەمی بیری پێشکێش کرد بە تۆ (بەرکاری تیان).
پرۆفیسۆر زدرێ دوابەرهەمی بیری بەتۆ پێشکێش کرد.
پرۆفیسۆر زدرێ دوا بەرهەمی بیری پێشکێش بەتۆ کرد.
دیارخەریش لە کۆتایی ڕستەدا بەرچاو دەکەوێت بەتایبەتی لەو کاتانەی، کە ناوە دیارخراوەکەی بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبێت، یائاوەڵ ووشەی کار دەبێت:
من نامەیەکم بۆ تۆی ژیر نارد.
بۆ تۆی ژیر من نامەیەکم نارد.
من نامەیەکم نارد بۆ تۆی ژیر.

| من | نامەیەکم | نارد | بۆ | تۆی | ژیر |
|---|---|---|---|---|---|
| سەر | بەرکاری | ووشەی | بەرکاری | ئامرازی | دیارخەر |
| کار | ڕاستەوخۆ | کار | تیان | خستنەسەر | |

شارا بۆ شاری هەولێر گەڕایەوە.
شارا گەڕایەوە بۆشاری هەولێر

| شارا | گەڕایەوە | بۆ شار | ی | هەولێر |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| سەرکار | ووشەی کار | ئاوەڵ ووشەی کار | ئامرازی خستنەسەر | دیارخەر |

٣ــ١٧زۆر بەدەگمەن دیارخەر لە ناوی دیار خراوەکەی دادەبڕێت و دەکەوێتە کۆتایی ڕستە: (کەریمی ئەیوبی و ئیرا سمیرنۆڤا ١٩٦٨، د. کوردستان موکریانی ـ ١٩٨٦):

هەڵۆ چەند سێوێکی لێکردەوە سۆر و جووان.

هەڵۆ چەند سێوێکی سۆر و جوانی لێکردەوە.

## ئەنجام

سینتاکسی ڕستەی کوردی وەک سینتاکسی ڕستەی هەر زمانێکی دی لەنێو ڕێزماندا شوێنی نێوە ڕاستی گرتۆتەوە، سینتاکس لە نێو بابەتەکانی دی ڕێزمانیدا سەربەخۆیەکی ئۆتۆنۆمی هەیە.

سینتاکس لە هەموو زمانێکدا هەر هەمان باری ڕێزمانی دەبێت و کۆمەڵە ووشەیەکی سینتاکسی، کە برێتی دەبێت لە بەشی بنجی ڕستە، توانای ئەوەند بەهێزە و فراوانە کاریگەرێکەی دەکەوێتە سەر تەواوکارو بەشانی دیش لە ڕستەدا.

ڕستە برێتیە لە فرێزی ناوی و لە فرێزی کاری، کە ئەم هەردوو فرێزەش بۆیان هەیە فراوانتر بکرێن و فرێزی کاری بۆی هەیە لە فرێزی ناوی فراوانتر ببێت.

ڕستە بۆی هەیە هەر تەنێ لە فرێزی کاری پێک بێت، بەبێ فرێزی ناوی.

بەشێوەیەکی گشتی سەرکاری فرێزی ناوی دەکەوێتە سەرەتای ڕستەوە و هەرگیز ناکەوێتە کۆتایی ڕستەوە و هەمیشە لە ڕستەدا بە پێش فرێزی کاری دەکەوێت و گونجانێکی ڕێزمانی تەواو لە نێوان سەرکار و کاری فرێزی کاریدا هەیە.

بەرکاری ڕاستەوخۆ ناکەوێتە کۆتایی ڕستەوە و هەردەم بەپێش کاری

فـرێزی کـاری کـەوتووە، بەڵام بەرکـاری ناڕاسـتـەوخـۆ بۆی هەیە لە پێش ووشەی کار و لە پاش ووشەی کاریش ببیندرێت.
هەر ڕستـەیەکی فـرێزی کاری برێتی بێت لە کارێکی تێپـەڕ بۆی هەیە بەرکـارێکی ڕاسـتـەوخۆ بەشداری تێدا بکات، بەڵام بەرکـاری ناڕاسـتـەوخۆ دەتوانێت لە دانەیەک زێتر بێت.
دیارخـەر سـەربەخـۆی ئەوەی نیـیـە، کـەبە تەنێ لە ڕسـتـەدا بێت وەکـو بەشەکانی دی ڕستە، بەڵکو هەموو بەشەکانی دی ڕستە ووشەی کاری لێ دەربچێت دەبن بە ناوی دیارخراوی دیارخەر و چ بە پێشی دەکەون و چ بە پاشی، کە لەم بارەی دووەمیدا ئامرازی تایبەتی خستنە سەریان لەگەڵدا بە کاردێت.
دیارخەر بۆی هەیە لە ڕستەدا لە دانەیەک زێتر بەکاربێت و بەجۆرێک لە ڕادەبەردەر بێت. ئەگەرچی نە لە کسەکردن و نە لە نووسیندا بە شێوەی ڕادە بەدەری بەکـار نایەت، بەڵام لە نێـو تیکسـتـی وێژەییـدا دیارخـەر بە شێوەیەکی فراوان بەکاردێت.
هەمـوو جـۆرەکـانی ئاوەڵ ووشـەی کـار (شـوێن، کـات، چۆنیـەتی و هتو...) بۆیان هەیە لە تاکە ڕستـەیەکدا بەکاربێن و هەمووشیـان بـۆ کـاری فـرێزی کاری دەگـەڕێنەوە، بەشێـوەیەکی سـەرەکـیش بە پێش فـرێزی کـاری دەکەون و لە هێندێک باردا دەکەونە کۆتایی ڕستەوەش.
تەواوکەرەکانی فرێزی کاری و فرێزی ناوی «بەرکاری ڕاستەوخۆو تیان، دیارخەر و ئاوەڵ ووشەی کار) کە کەوتوونەتە نێوانیان، بۆیان هەیە لە نێو خۆیاندا ئاڵوگۆڕ بکەن و لەیەک ڕستە دەیان ڕستە داڕێژن (بڕوانە پاشکۆی ژمـارە(٢) کـە بە ڕێگەی ئاڵـوگـۆڕ کـردنی تەواوکـەرەکـانی فـرێزی ناوی و فــرێزی کــاری دەیان ڕســتــە داڕێژراون و هێــژ بۆیان هەیە دەیانی دیش داڕێژن».
کە تەواوکەرەکانی فرێزی کاری و فرێزی ناوی بە پێی یاسای تایبەتی ڕێزمانی دەگوێزرێنەوە بۆ سەرەتا وەیا کۆتایی ڕستەوە، بەمە فرێزی کاری و فرێزی ناوی دەکەونە نێوەڕاستی ڕستەوە.

**پاشکۆی ژماره (١)**

من نەچووم.

من بۆ شنۆ نەچووم .

من پار بۆ شنۆ نەچووم.

من پار نەچووم بۆ شنۆ.

من بۆ شنۆ پار نەچووم.

من نەچووم بۆ شنۆ پار.

من بۆ شنۆ نەچووم پار.

پار من نەچووم بۆ شنۆ.

پار من بۆ شنۆ نەچووم.

پار بۆ شنۆ من نەچووم.

بۆ شنۆ من پار نەچووم.

* نەچووم من بۆ شنۆ پار.

* نەچووم بۆ شنۆ من پار.

* نەچووم بۆ شنۆ پار من.

* نەچووم پار بۆ شنۆ من.

پاشکۆی ژمارە ٢

| گەوهەر | پار | لەزاخۆوە | خێرا | نامەیەکی | کورتی | بۆ من | نارد |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| " | لەزاخۆوە | پار | " | " | " | " | " |
| " | " | خێرا | پار | " | " | " | " |
| " | " | " | نامەیەکی | کورتی | پار | " | " |
| " | " | " | " | " | بۆ من | پار | " |
| گەوهەر | لەزاخۆوە | خێرا | پار | نامەیەکی | کورتی | بۆ من | نارد |
| " | خێرا | لەزاخۆوە | " | " | " | " | " |
| " | " | پار | لەزاخۆوە | " | " | " | " |
| " | " | " | نامەیەکی | کورتی | لەزاخۆوە | " | " |
| " | " | " | " | " | بۆ من | لەزاخۆوە | " |
| گەوهەر | خێرا | پار | لەزاخۆوە | نامەیەکی | کورتی | بۆ من | نارد |
| " | پار | خێرا | " | " | " | " | " |
| " | " | لەزاخۆوە | خێرا | " | " | " | " |
| " | " | " | نامەیەکی | کورتی | خێرا | " | " |
| " | " | " | " | " | بۆ من | خێرا | " |
| گەوهەر | نامەیەکی | کورتی | پار | لەزاخۆوە | خێرا | بۆ من | نارد |
| " | پار | نامەیەکی | کورتی | " | " | " | " |
| " | " | لەزاخۆوە | نامەیەکی | کورتی | " | " | " |
| " | " | " | خێرا | نامەیەکی | کورتی | " | " |
| " | " | " | " | بۆ من | نامەیەکی | کورتی | " |

تەواوکاری پاشکۆی ژمارە ٢

| گەوهەر | بۆ من | پار | لەزاخۆوە | خێرا | نامەیەکی | کورتی | نارد |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| " | پار | بۆ من | " | " | " | " | " |
| " | " | لەزاخۆوە | بۆ من | " | " | " | " |
| " | " | " | خێرا | بۆ من | " | " | " |
| گەوهەر | پار | بۆ من | نامەیەکی | کورتی | خێرا | لەزاخۆوە | نارد |
| " | " | نامەیەکی | کورتی | بۆ من | " | " | " |
| " | " | بۆ من | نامەیەکی | کورتی | " | " | " |
| " | " | خێرا | بۆ من | نامەیەکی | کورتی | " | " |
| " | " | " | " | لەزاخۆوە | نامەیەکی | کورتی | " |
| " | " | " | نامەیەکی | کورتی | بۆ من | لەزاخۆوە | " |
| " | " | نامەیەکی | کورتی | خێرا | " | " | " |
| " | " | " | " | بۆ من | خێرا | " | " |
| " | " | " | " | " | لەزاخۆوە | خێرا | " |
| " | " | لەزاخۆوە | بۆ من | نامەیەکی | کورتی | " | " |
| " | " | بۆ من | لەزاخۆوە | " | " | " | " |
| " | " | " | نامەیەکی | کورتی | لەزاخۆوە | " | " |
| " | " | " | خێرا | نامەیەکی | کورتی | لەزاخۆوە | " |

## پەراوێز

١) پانینی (سالاتورا ـ لە باکووری هیندستاندا لە سەدەی پێنج، چوار وەیا سێی پێش زاییندا ژیاوە) دانەی ڕێزمانی سانسکریتییە ئەشتا ثیایی (= بەرهەمی هەشت بەرگی).

پانینی لەم لێکۆڵینەوە ڕێزمانییەدا هێندێک شێوەی ماتماتیکی وای خستۆتە ڕوو شایەنی لێکدانەوەیە، لە دوای نووسینی ئەشتا ثیایی دا بە دەیان سەدە دەیان ڕێزمان ناس تێبینیان لەسەرداوە و لێی دواون و وەکو سەرچاوەیەکی بەنرخ سوودیان لێ وەرگرتووە و لەگەڵ زمانانی دیدا بەراوردیان کردووە، بۆ زانیاری زێتر بڕوانە Grote Winkler Prins Encyclopedie, Deel 18, Achtste Druk , 1979-1984 Amsterdam- Elssvier Antwerpen.

٢) د. وریا عمر امین لە بابەتی بەنرخی (بیناغەی سادەترین ڕستەی کوردی)دا دەڵێت {(ـ ان) و (ـ ێک) هەرگیز پێکەوە دەرناکەون} ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١١سالی ١٩٨٦لاپەڕە ١٨٦.

٣) د. نەسرین فەخری لە شەستەکانەوە بایەخی بەو لایەنانەی کارداوە، کە لە واتایەک زێتریان بەخشیوە و زانایانە لێیانی کۆڵیوەتەوە و بلاوی کردونەتەوە، بەلام بەداخەوە لێردا هیچ بەرهەمێکی ویم لەبەر دەستدا نییە بۆ ئەوەی بتوانم هێمای بۆ بکەم.

٤) لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا ئەم یاسایە لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕدا پێرە و ناکرێت، چونکە کۆمەڵە جێناوی لکاوی (ـ م، ـ ت، ـ ی، ـ مان، ـ تان، ـ یان) لەم دیالێکتەدا نییە، بۆیە هەمیشە جێناوی کەسی جودا لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕدا بەکاردێت:

من، تە، وی، وێ، مە، وە، وان/نڤیسی.

٥) بۆ وەرگرتنی زانیاری زێتر دەتوانین بە بیرو ڕای پرۆفیسۆر کوردۆێڤ (کوردۆێڤ ـ ١٩٨٤) بچینەوە لەبارەی بنچینەی (هەبوون، هەبوو، هەـ)کە لاپەڕە(٢٢٠ـ٢٢٢) و (٢٧٢ـ٢٨٤) بۆ ڕوونکردنەوەی ڕەگی کاری(بوو) و (هەبوو) تەرخان کردووە؛ لە پێوەندی ڕێزمانی نێوانیان و دەمکاتی ڕانەبوردوو و ڕابوردووی، دەمکاتی ناکردن و کۆتایی کەسیەکانی و پێوەندی (هەیین) بە (هەبوون) لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی ژووروو و کرمانجی نێوە ڕاستدا، کەچی

محمود فتح الله احمد له نامەی ماجستێریدا، کە بەنێوی (کار تەواوکردن له کوردی دا)یه و له ژێر سەرپەرشتی مامۆستا محمد معروف فتاح دا، کە بە بیرو ڕای ئەو ڕێزمان نووسانەدا دەچێتەوە، کە بەر لەو له(بوون) و (هەبوون)یان کۆڵیوەتەوە وا پیشان دەدات، کە هیچ شتێکی ئەو تۆیان لەسەر نەنووسیوە، کەچی دەبینین هەرچی پرۆفیسۆر کوردۆێڤ له بارەی ئەم دوو کارەدا نووسیویەتی کاک محمود دووبارەی کردۆتەوە و هیچ شتێکی تازەی ئەوتۆی نەخستۆتە سەر، تەنێ ئەوە نەبێت، کە بە شێوەیەکی وا تێکەڵ و پێکەڵ نووسیوبەتێوە کەس نەتوانێت سوودی لێ وەربگرێت.

٦) لەپاڵ ئەو ئەرکانەشدا کاری (بوو) وەک هەر کارێکی تێنەپەڕ له ڕستەدا ڕۆڵی دیاریکراوی خۆی دەگێڕێت:

دایکت بوو.

کاری (بوو) وەک پاشکۆیەکی ڕێزمانی دەکەوێتە کۆتایی کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ بۆ داڕشتنی کاری ڕابوردووی دوور:

نووسیبوو، گرتبوو.

ناو بە پێش کاری بوو دەکەوێت، بۆ داڕشتنی کارێکی ناسادەی تێنەپەڕ، کە ڕۆڵی فرێزی کاری دەگێڕێت:

بوو_ هێرۆ بوو _ ئەو ژنە هێرۆ بوو.

ئاوەڵناویش بە پێش کاری (بوو) دەکەوێت و کارێکی ناسادەی تێنەپەڕ دادەڕێژێت و ڕۆڵی فرێزی کار دەگێڕێت:

بوو_ چاک بوو _ کارەکە چاک بوو.

هەروا جێناویش بە پێش کاری (بوو) دەکەوێت و کارێکی ناسادەی تێنەپەڕ دادەڕێژێت:

بوو_ هەموو بووین _ ئێمە هەموو بووین.

ئاوەڵکاریش بەپێش کاری(بوو) دەکەوێت و کارێکی ناسادەی تێنەپەڕی لەگەڵدا دادەڕژێت و ڕۆڵی فرێزی کاری دەگێڕێت:

بوو_ هەمیشە بوو _ کار هەمیشە بوو.

چاوگیش بە پێش کاری(بوو) دەکەوێت و کارێکی ناسادەی تێنەپەڕ دادەڕێژێت و ڕۆڵی فرێزی کاری دەگێڕێت:

بوو- پێشکەوتن بوو ـ ئاواتم پێشکەوتن بوو.

کاری (بوو) لە بارەی سینتاکسی دیشدا بەکار دێت بڕوانە (د.کوردستان موکریانی ـ ١٩٨٦).

٧) بڕوانە بەرهەمم (سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردی دا، ١٩٨٦، ١٠١ـ ١٠٨)کە باسی بەکارهێنانی کۆمەڵەی ناوی(ناو، ئاوەڵناو، جێناوی کەسی جودا و جێناوی لکاو، جێناوی نیشانە، جێناوی پرسیار، جێناوی چەندی و چۆنی و خۆیی، ئاوەڵناو و جۆرەکانی و چاوگ)لەگەڵ باسکردنی باری چەسپیو و نەچەسپیوی ئەم تەواوکارانەی (بوو) لەگەڵ بەشداربوونی ڕەگەزانی دی ڕستە لە نێوانیاندا بە تایبەتی دیارخەر دەکەم و هەروا لەو ئامرازانەشم کۆڵیوەتەوە، کە لەم بارەدا بەکاردێن، کەچی دەبینین محمود فتح الله لە نامەی ماجستێریدا، کە لە پنتی پێشوودا نێوم بردووە، لە پێداچوونەوەیدا بە بەرهەمی ئەوانەی لەم بابەتە دواون هەرگیز هێما بۆ ئەم باسەی من ناکات و بەڵکوو دەڵێت هەموو ئەو ڕێزمان نووسانەی بەر ئەو هەر تەنێ لە ناو و ئاوەڵناو دوواون وەکو تەواوکاری (بوو) و هیچیان باسی بەشەکانی دی ئاخاوتن ناکەن و هەروا باسی ئەو ئامرازانەش ناکەن، کە لەم بارەدا بەکاردێن.

ئەوەی شایەنی باسە نامەکەی محمود هەر لە سەر ئەم هەڵسەنگاندنە نابابەتانە ناوەستێت، بەڵکو هەتا ژمارەی ئەو لاپەڕانەی، کە لە بارەی ئەم بەرهەمەی مندا هێمای بۆ کردووە هەموویان هەڵەن!!

## ژێدەر


د. جمال نەبەز ١٩٧٦ زمانی یەکگرتووی کوردی. بامبێرگ.

د. کەناتی کوردۆ ١٩٨٤ ڕێزمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی). بەغدا (د. کوردستان موکریانی لە زمانی ڕووسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی).

د. کوردستان موکریانی ١٩٨٦ سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا. بەغدا.

د. كردستان مكرياني ١٩٨٦ قواعد اللغة الكردية. بغداد.

د. كردستان مكرياني ١٩٩٠ المبتدأ في الجملة الكردية مقبول للنشر في مجلة (الابحاث).

د. كردستان مكرياني ١٩٩٠ الخبر في الجملة الكردية (مقبول للنشر في مجلة (الابحاث).

د. محەمەد ڕەزای باتینی ١٩٩٣ ئاوڕێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان. سوید. (وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە بۆ سەر زمانی کوردی ــ حەسەنی قازی).

د. وریا عمر أمین ١٩٨٦ بیناغەی سادەترین ڕستەی کوردیٰ. کۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە(١١١). لاپەڕە ١٨٣ــ١٩٠. بەغدا.

د. زەرێ یوسوپۆڤا، شێوە زاری سلەیمانی (د. کوردستان موکریانی لە زمانی ڕووسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ــ دەستنووسە).

Bloomfield L., 1933 Language . George Allen & Unwin . New York .

Boole, G., 1847 The Mathematical Analysis of Logic . Londen .

Brandt Corstius , H., 1977 Wat Is Algebraische Taalkunde ? In : B. Tervoort (red) Wetwnschap & Taal , 34 - 46 , Muiderberg .

Bresnan, J., 1982 The Mental Representation of Grammatical Relations.Cambridge Mass .

Chomsky, N., 1957 Syntactic Structures.The Hague.

Chomsky, n., 1965 Aspects of the Theory of Syntax. Cambridge, Mass.

Chomsky, n., 1975 The Logical Structure of Linguistic Theory. New York.

Droste, F. G. en van Eynde, 1991 Hoofdlijnen In de Transformationele Taaltheorie. Leuven.

Friedman, J., 1971 A computer Model of Transformational Grammar. New York.

Gerritsen, M., 1987 Sytaktische verandering in kontrolezinnen. Dordrecht.

Ginsburg, S., 1966 The Mathematical Theory of Context Free Languages. New York .

Haan, G. J. de, 1991 Leidse voorlichting over generatieve grammatica , In : De Nieuwe Taalgids , 84 - 3, 193 - 208.

Houet, Henriette, 1994 Grammatica Nederlands . Utrecht .

Koopman, H., 1984 The Syntax of Verbs . Dordrecht .
Koster, J., 1978 Locality Principles in Syntax. Dordrecht.
Koster, J., 1987 Domains and Dynasties: The Radical Autonomy of Syntax. Dordrecht.

Landsbergen, S.P.J., 1977 Wat Is Computer - Linguistiek ? In: B. Tervoor (red) Wetenschap & Taal . 47 - 65 . Muiderberg.
LUIf, J., 1987 In verband met de Zin . Inleiding in de Spraakkunst . Leiden .
Model, Jan, 1991 Grammatische Analyse Syntactische Verschijnselen van het Nederlands en Engels . Dordrecht .

Mustajoki A. & Heino H., 1991 Case Selection for the Direct Object in Russian Negative clauses. Helsinki.

Nieuwenhuijsen, P., 1990 Beter Nederlands . Utrecht .
Quine, W. V. O., 1951 Mathematical Logic . Revised edition . Cambridge .
Radford, A., 1988 Transformational Grammar . Cambridge.
Russell, B., 1903 The Principles of Mathematics . Londen .

Schank, R. C. and K. M. Colby 1973 Computer Models of Thought and Language . San Francisco .

Sheffer, H. M., 1913 A Set of Five Independent Postulates for Booiean Algebras with application to Logical Constants. In: Transactions of the American Mathematical Society 14 , 481 - 488 .

Sikorski, R., Boolean Algebras . Third edition . Berlin: Springerverlag, 1969. (Argebrisse der Mathematik und ihrer Grenzgebiete 25) .

Stone, M. H. 1936 The Theory of Represenitaions for Boolean Algebras. In: Transactions of the American Mathematical Society 40 , 37 - 111 .

Sturm, A. en F., Weerman, 1983 Generatieve Syntaxis . Leiden .

Sturm, A., 1986 Primaire Syntactische Structuren in het Nederlands , Leiden.

Tarski, A., 1955 Matamathematical Proofs of Some Representation Theorems for Boolean Algebras. In: Bulletin of the American Mathematical Society 61, 525.

Zonnenberg J. G., 1994 Grammatica Engels Utrecht .

Zonneveld R. van, 1994 Kleine Syntaxis van het Nederlands . Dordrecht .

Zwarts, F., 1986 Categoriale Grammatica en Algebraische Semantiek , Diss.Groningen.

Акимова Г. Н. 1990 Новое в синтаксическом строе современного русского языка. М.

Арутюнова Н. Д., Ширяев Е. Н. 1983 Русское предложение. М.

Бабайцева В. В. 1988 Система членов предложения в современном русском языке. М.

Бакаев Ч. Х. 1973 Язык курдов СССР. М.

Курдистан Абдул Рахман Латиф 1976. Определение и способы выражения определительных отношений в курдском языке. канд. дис. М.

*Курдоев К.К.*, 1957. Грамматика курдского — языка. М.-Л.

*Курдоев К.К.*, 1978. Грамматика курдского языка на материале диалектов курманджи и сорани. М.

Ломов А. М. 1994 Типология русского предложения. Воронеж.

Мухамед Фарук Омар Садык. 1977 Именное словообразование в литературном языке курдов Ирака. Автореф. канд. дис. М.

Эйюби К.Р., Смирнова И.А. 1968. Курдский диалект мукри. Л.

Юсупова З.А. 1981 Изафетные конструкции в сулейманийском диалекте курдского языка. — Иранское языкознание. М.

## پێڕست